زاراوەی نوێ یان :

# فەرهەنگی نوێ



بورهان قانع

١٩٨٥

زاراوەی نوێ یان :

١٩٨٥

سالی ١٩٨١ کراوە بە کوردی

- **بۆ دانانی ئەم کتێبە سود لە نوسینی ئەم نوسەرانە وەرگیراوە :**
- داریوش ئاشوری ، دکتور بەهاددین پازارگاد ، روزبە کە بە فارسی ئامادەیان کردوە ٠٠
- برهان قانع کردویەتی بە کوردی
- چاپخانەی (الحوادث) بەغدا
- چاپی یەکەم ١٩٨٤

## پێشەکی :

جگە لەوەی کتێبخانەی کوردی پێویستی بە کتێبێکی وەکو «فەرهەنگی نوێیان سیاسی » هـــەیە ، گۆڕینی بەرهـــەمو داهێنانی نوێش خـۆی لە خۆیدا یەکێـکە لە هۆیە گرنگەکانی هاتنە کایەی چەنـدن زاراوەی تازە لە رۆژێـکدا « هەروەکو تیوری زانیـکی بەناوبانگ !! » ئـەوەی سەلماندوە کە بە هۆی داهێنانی نوێو گۆڕینی باری بەرهەمەوە زمانێـکی یەکگرتووی جیهانی پەیدا ئەبێ .. بەڵام کەی ؟ ...

ئەو زاراوانەی ئیستا پێی ئەدوێین تارادەیەك بونەتە هـۆی ئەوەی زمـان سنووری سەدەیەك لەمەوبەر بشکێنێو روخسارێـکی تازە بکاتـە بەر . گەلێك زاراوەی تازە هەیە ـ بە تایبەتی سیاسی ـ کە لە زۆر کاتو شوێندا بەکار دێنو زۆر کەس لە بیسەران ـ بە تایبەتی ئەوانەی لە ژیانی شارستانێتیو تەکنیکی سەردەمەوە دورن ـ لێی تێ ناگەن .

حـــەزم ئـەکرد توانای ئـەوەم هـەبێت « فەرهەنگێـکی ـ وەکو ئەمەی لە بەردەستدایە ـ رێـکو پێـك تر بکەمە دیاریو پێشکەشـی

کتێبخانەی کوردیو خوێنەرانی کوردی بکەم • هەرچەند ئەم کارە کاری تەنیا کەسێك ـ بە تایبەتی من ـ نیە بەڵکو کارێکی هەرە وەزیانەی چەند کەسێکی بەتوانایە لەم بوارەدا • بەڵام ئەوەندە ئەمکارەم بە پێویست ئەزانی گۆڕینی ئەم فەرهەنگەم بە کوردی کردە بەشێکی دەرکەوتوی ئەو پرۆژە روشنبیری یەی کە بە دەستمانەوەیە ، بەو نیازەی خوێنەری کورد بەرێزەوە سەرنجی بدەنو سودی لێ وەربگرن •

ئەم فەرهەنگە روزبێ بە فارسی ئامادەی کردوەو منیش لە فارسیەکەوە کردومە بە کوردی ، جگە لەوەش چەند زاراوەیکی تریشم لە چەند سەرچاوەیەکی ترەوە وەرگرتوە(1) پێویست بە دەست نیشان کردنیان ناکات ئەوانیشم تێکەڵ بە زاراوەکانی روزبێ کردوە •• لە هەندێك شوێندا چەند رستەیەکمان لە نوسینەکانی روزبێ لابردوە ئەوەش هەر یەکەی لەبەر هۆیەك بووە ، پێم وایە خوێنەرانی کورد لەم بوارەدا گلەییم لێ ناکەن •• ئەگەر زاراوەیەك یان چەند زاراوەیەکیشمان نەکردبێتە کوردی ئەوەش دیسان بێ مەلامەت نیە •

هیوام وایە خوێنەرە بەرێزەکان بە چاوی رێزەوە سەیری بەرهەمە پڕ لە کەمو کورتیەکەمان بکەن ••

**برهان**

---

(1) لەگەل هەندێك لە نوسنیەکانی داریوش ئاشوری د• بەهاددین پاژارگاد •

## ئەو وشانەی لەم فەرهەنگەدا کۆ بونەتەوە ..

| | |
|---|---|
| ئاپارتاید | Aparteid |
| ئیئتیلاف | Eieitlaf |
| ئاپارتهید | Apartheide |
| ئوپورتونیسم | Opportunisme |
| ئاپولیتیسم | Apolitisme |
| ئوتوکراسی | Autocracy |
| ئیرتیجاع | Reaction |
| ئاریسوکراسی | Aristocratie |
| ئیستیبداد ـ ئەپسولوتیسم | Absolutisme |
| ئیستیثمار | Exploi Tation |
| ئیستیعمار | Colonisation |
| ئابوری سیاسی | Economiepolitigue |
| ئالیگارشی | Oligarchie |
| ئیمپریالیزم | Imperialisme |
| ئیمتیاز | Concession |
| ئانارشیسم | Anarshisme |

| | |
|---|---|
| Indivdualisme | ئاندیڤیدۆئالیسم |
| Internationalisme | ئەنتەرناسیۆنال |
| I - Proletarion | ئەنتەرناسیونالیستی پرولیتاری |
| Revolution | ئینقلاب «شورش» |
| Inquistion | ئانکیزیسیۆن |
| Humanisme | ئومانیسم |
| Ideologie | ئایدیۆلۆجی |
| Anti - Semitism | ئانتی سمیتیزم |
| Boycottage | بایکوت |
| Blankisme | بلانکیسم |
| Bourgeoisie | بۆرجوازی |
| B-comprador | بۆرجوازی کۆمپرادۆر |
| Bureaucracy | بۆرۆکراسی |
| Barbarism | بەربەریسم |
| Parlman | پارلمان |
| Pacifisme | پاسیفیسم |
| Proletariat | پرۆلیتاریا |
| Propagande - Agitation | پروپاگەندە ـ ئاژیتاسیۆن |
| Terrorism | تیرۆریسم |
| Theorie | تیوری |
| Technocracy | تەکنۆکراسی |
| Totaliterisme | توتالیتریسم |
| Fifth Campaign | تابوری پینجەم |
| Timocracy | تیموکراسی |

| | |
|---|---|
| جیۆپلیتیك | Geopolitique |
| جەنگ | War |
| جیهان بینی | Prospects |
| چین ـ « طبقة » | Class |
| حزب | Party |
| خودموختاری | Self - Determination |
| دسپۆتیزم | Despotisme |
| دوگماتیزم | Dogmatisme |
| دیماگۆجی | Demagoge |
| دیموکراسی | Democratie |
| دەولەت | Repoplice |
| دیالەکتیك | Dialectic |
| دیپلۆماسی | Diplomacy |
| دیکتاتۆری پرۆلیتاریا | Dictaturedu Proletariat |
| دیواری چین | China Wall |
| ریالیزم | Realism |
| ریفراندۆم | Referendum |
| رادیکالیسم | Radicalisme |
| راسیسم | Racisme |
| ریفۆرم | Reforme |
| ریفیژیۆنیزم | Revisionisme |
| زایۆنیزم | Scionisme |
| ژیرخانو سەرخان | |
| سزاریسم ـ تزاریسم | Czarisme, Tsarisme |

| | |
|---|---|
| Socialisme | سوشیالیزم |
| Censeur | سانسۆر |
| Centralisme Democratique | سانترالیسمی دیموکراتی |
| Capitalisme | سەرمایەداری |
| Sectarisme | سکتاریسم |
| Syndicat | سندیـکا |
| Strategieet, Tactigue | ســتراتیجو تاکـتیك |
| Stalinism | ستالینیزم |
| Diplomacy | سیاسەت |
| Referendum | سیستەمی هەڵبژاردن |
| Chauvinisme | شوڤینیزم |
| Objectif, Subjectif | عەینیو ذهنی |
| Fabianism | فابینیزم |
| Fascisme | فاشیزم |
| Falangisme | فالانخیزم ـ فالانژیزم |
| Fevmàciun | فرماسیۆنی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری |
| Farmer | فارمر |
| Feodalisme | فیودالیزم |
| Fedration | فیدراسیۆن |
| Fabianisme | فابیانیسم |
| Veto | ڤیتۆ |
| Escalavagisme | کۆیلەییتی |
| Republic | کۆمــــاری |
| Cosmopolitisme | کوسمۆپولیتیسم |

| | |
|---|---|
| Colture | کولتوور |
| Capitulation | کاپتیۆلاسیۆن |
| Prolitare | کرێکاری کشتوکالی |
| Commune | کۆمونی سەرەتایی |
| Kynak | کۆلاك |
| Capitalisme | کاپیتالیزم |
| Conservatisme | کۆنسرواتیزم |
| Confederation | کۆنفیدراسیۆن |
| Latifundiste | لاتیفۆندیست |
| Lumpen Proletariat | لۆمپن پرولیتاریا |
| Liberalisme | لیبرالیسم |
| Mobocracy | مۆبۆکراسی |
| Mccarthysme | ماك کارتیسم |
| Machiavelisme | ماکیافیلیسم |
| Maltusianisme | مالتۆسیانیسم |
| Manifeste | مانیفێست |
| Metrople | مەترۆپۆل |
| Nationalisation | میللی کردن |
| Militarisme | میلیتاریسم |
| Nazism | نازیزم |
| Nationalisme | ناسیونالیزم |
| Neocolonialisme | نیۆ ئیستیعمار |
| Produstion Forces | هێزەکانی بەرهەم هێنان |
| Produetion Means | هۆیەکانی بەرهەم هێنان |
| Humanism | هیۆمینیسم |
| Uniscef - UNICEF | یۆنسێف |
| Unesco - UNESCO | یۆنسکۆ |

## ئاپارتایـد Aparteid

وشەیەکی ئینگیلزی‌یە ، بە شێوەیەك لە دڕندانە ترین شێوەکانـی جیـاوازی رەگەزایەتـی ئەڵێـن .. بریتی‌یـە لـە سیاسـەتی جیاوازی رەگەزپەرستی‌یانە ، کە رەگەز پەرستەکانی کۆماری ئەفەریقای خوارو لە دژی زوربەی دانیشتوان ـ کە رەش پێستو هیندیـن لەو وڵاتـەدا ـ بەکاری ئەهێنن .

لە روی زانستی زمانەوە ئەم زاراوەیە بە مانا لەتکردن‌و جیاکردنەوە ئەگەیەنیت . ئاپارتاید ( Aparteid ) واتا جیاکردنەوەی ئەو خەڵك‌و رەگەزانەی کە سپی پێست نین ، ناچار کردنیان‌و نیشتەجێ کردنیان بـە ناچاری لەو شوێن‌و ناوچانەی کە بۆیان دائەنرێت .. بێبەش کردنیان لە هەمو مافێـکی سیاسی‌و خوێندن‌و پێشکەوتن . ئەو شوێنانەی کە بە زۆر بۆیان دیاری ئەکرێ تیایا نیشتەجێ بکرێن توانای لێ دەرچونیان نابێت . تەنانەت پێداویستیەکانی ژیانیان بۆ دابین ناکرێ .

لە ئەنجامی راپەڕینی خەڵك‌و هەروەها هەڵوێست‌و کرداری خەڵك‌و دەوڵـەتە پێشـکەوتووەکانی وڵاتانی ئاسیاو ئەفـەریقـا ئاپارتاید بـە شتێـکی نائاسایی ناسراوە ، دەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان چەند جارێك ئاپارتایدی بە کرداری دژی مرۆڤ داناوە .. بەڵام بە هـۆی سیاسەتی دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکانەوە ـ کـە خۆی لە خۆیدا ریشەو سەرچاوەی رەگەز پەرستی‌یە ـ لە زوربەی ئەو شوێنانەدا کە دەسەڵاتیان تیا هەیە ئەم سیاسەتە نالەبارە بەردەوامەو کاری پێ ئەکرێ .

## ● ئیئتیلاف Eieitlaf

یەکگرتنی کـــاتی ڕێکخراوو کۆمەڵە سیاسی یەکانە لـە پێناوی بەدەست هێنانی ئامـانجی پارلمانیو هەلبژاردندا • لەو ڕیژیمە پارلمانیانەدا چەند ڕێکخراوو کۆمەڵێـکی سیاسی یەك ئەگرن کە هیچ کامێـکیان بە تەنیـا توانای بە ئەنجام گەیاندنی ئارەزووی سیاسی خۆیان نیە •

ئیئتیلافی پارلمانی ، زۆر جار بۆ خۆ هێشتنەوە یان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێـکی تایبەتی ئەبێت • لەو حاڵەتەدا کۆمەڵو ڕێـکخراوەکان ، گەورەو بچوك یەك ئەگرن تاکو بە هۆی ئەو یەکگرتنە یانەوە بەشێك لە دەسەڵات بگرنە دەست •

لەوانەیە ئیئتیلاف ڕواڵەتێـکی تێـکدەرانەشـی هەبێت ، واتا بـە نیازی ڕوخاندنی دەسەڵاتەوە یەك بگرن ، هەروەکـو چـۆن لە وڵاتی فەرەنسـە ڕویدا •• کە لە پاش دووەمین شـەڕی جیهانی ڕێـکخراوە سیاسی یەکان یەکیان گرتو چەند جارێـك دەوڵەتیان ڕوخاندو ، ڕێژیمو شیرازەی حوکمیان هەڵوەشاندەوە ، ئەمەیان پێ ی ئەڵێـن « ئیئتیلافـی سەلبی » یان بەرهەلستکار ••

لە ئیئتیلافی هەڵبژاردندا دو ڕێکخراو یان چەنـد ڕێـکخراوێـك بە قازانجی یەکتر دەنگ ئەدەنو ناوچە هەلبژاردنیەکان بە پێ ی توانای خۆیان بە سەر خۆیاندا دابەش ئەکەن ، هەروەکو چـۆن لـە چوارەمین کۆماری فەرەنسەدا ڕویدا •

## ● ئاپارتهید Aparthende

بە سیاسەتی جیاوازیخوازیو ڕەگەز پەرستی دەوڵەتی ئەفەریقای خوارو ئەوترێ کە لەساڵی ١٩٤٨ەوە کاری پێ ئەکرێ • لـە ئەفەریقای

خوارو ، له نیوەی سەدەی حەڤدەیەمەوە کە ئەوروپاییەکان دەستیان کرد بە دەستێوەردانی ولاتەکەیان بەردەوام جیاوازی رەگەزایەتی هـــەیە ، حزبی میللی ـ حزبی گەل کە لە ساڵی ١٩٤٨ دا دەسەلاتی سیاسی ولاتی گرتە دەست چەند بڕیارێـکی بۆ ئەو رەگەزانە دەرکرد کە سپی پێست نین وە هەمو لایەنەکانی ژیانیانی تیا گرتەوە • [ لە ئەفەریقای خوارو لە ٨٠٪ی دانیشتوانیان سپی پێســت نین ] •• ئەو بڕیـارە بـۆ زیاتـر خـۆ سەپاندنی سپی پێستەکانە • بڕیارەکانی حزبی میللی سنووری بۆ مافـی سیاسی ، هاتوچۆ کردن ، دیاریکردنی شوێنی نیشتەجێ ، مڵـکداریتی ، دیاریکردنی ئیش‌و کار ، ژن هێنان‌و •••• بۆ ئەو کەسانە دیاریکــردوە کە سپی پێست نین •• مافی سپی پێستەکانی بە زیانی ئــەو رەگەزانــەی سپی پێست نین فراوان کردوە • لە ساڵی ١٩٥٣ دا بەشداریکردنی رەش پێستەکان‌و ئەو رەگەزانەی تر کە سپی پێست نین لە مانگرتن‌و رێپێواندا یان ژن‌و ژن خوازیاندا لەگەڵ سپی پێستەکانا بە تاوان دانراوە •

پەروەردەو فێرکردنی ئەو رەگەزانەی کە سپی پێست نەبون درابوە دەست « وەزارەتی کاروباری خەڵـکە خۆ ڕسکە کان » • ئەو وەزارەتەش هەر مامۆستایەك پەیڕەوی سیاسەتی رەگەز پەرستی نەکردبایە بە باشـی دانەئەنا • کۆمەڵی نەتەوە یەکـگرتووەکـان لە سـاڵی ١٩٥٢ دا کەوتـە لێـکۆڵینەوەی ئەم مەسەلە «ئاپارتهید » وە ئەمەی بە هەڕەشە کردن لـە ئاشتی‌و مافی ئادەمیزاد دانا •

بەلام دەوڵەتی ئەفەریقای خوارو رێـگای بەو لیژنەیە نەدا کـە بۆ لێـکۆڵینەوەی ئەمکارە دانرابون ، بچنە ولاتەکەیانەوە •

[ حزبی یەکـگرتو ] ، کە حزبێـکی بەرهەڵسـتکاری ئەفەریقـای خوارووە ناوەڕۆکی ئاپارتهید Apartheide بە باشـی ئەزانیـت بـەلام

کرداره‌کانی به‌دڵ نیه • ئه‌م سیاسه‌تی ره‌گه‌ز په‌رستی‌یه‌ی ئه‌فه‌ریقای خوارو ده‌وڵه‌تی له‌به‌رچاو جیهاندا ریسوا کردوه ، به تایبه‌تی له ئاسیاو ئه‌فه‌ریقادا • وه هه‌ر ئه‌م سیاسه‌ته بو که ئه‌فه‌ریقای خوارووی والیکرد له‌ناو یه‌کێتی ده‌وڵه‌ته هاو قازانجه‌کانی به‌ریتانیادا که‌ناره گیر بکرێ •

## ● ئۆپۆرتۆنیسم Opportunisme

هه‌لپه‌رست ، به شوێن هه‌لدا گه‌ڕان له پێناوی قازانجی تایبه‌تیدا ، له سیاسه‌تدا « ئۆپۆرتۆنیست » به‌و که‌سانه ئه‌وترێ که هه‌میشه خۆیان له خاوه‌ن ده‌سته‌ڵات نزیک ئه‌که‌نه‌وه‌و پابه‌ندی هیچ جۆره هه‌ڵوێستێك نین‌و هه‌مو هه‌ڵوێستێکی خۆیان دۆڕاندوه •

## ● ئاپۆلیتیسم Apolitisme

خۆ نه‌به‌ستنه‌وه به سیاسه‌ته‌وه ، خۆ پاراستن له جموجوڵ‌و کاروباری سیاسیانه ، ئه‌و که‌سانه‌ن که ڕێبازێکی ئاشکراو دیاری سیاسی‌یان نیه ، ئه‌م زاراوه‌یه له وشه‌ی « پۆلیتیك »ه‌وه هاتوه که به مانا سیاسه‌ت ئه‌گرێته‌وه‌و دانانی پیتی « ئا » له سه‌ره‌تای وشه‌که‌وه به مه‌فهومی ره‌تکردنه‌وه‌یه •• به واتایه‌کی تر بێ موبالاتی‌و خۆ تێ نه‌گه‌یاندن له کاروبارو ژیانی سیاسی‌و دوره په‌رێز وه‌ستان له سیاسه‌ت ئه‌گرێته‌وه • ئه‌مجۆره ڕێبازانه له کۆمه‌ڵگای سه‌رمایه‌داری‌دا ڕیژیمی سه‌رمایه‌داری بایه‌خی پێ ئه‌دات •• خۆ تێ نه‌گه‌یاندن له کاروباری سیاسی‌و گوێ نه‌دان به ژیانی کۆمه‌ڵایه‌تی‌و سیاسی ئه‌نجامی ئه‌وه‌یه که ده‌سه‌ڵاتدارانی ڕێژیمی سه‌رمایه‌داری هه‌میشه هه‌وڵ ئه‌ده‌ن کۆمه‌ڵانی خه‌ڵك له سیاسه‌ت دور بخه‌نه‌وه‌و له‌ناو ئایدیۆلۆجی‌یه‌کی دواکه‌وتوانه‌دا بیان هێڵنه‌وه • خه‌ڵکی له پێداویستی‌یه‌کانی کۆمه‌ڵ دور بخه‌نه‌وه‌و بیانخه‌نه سه‌ر ڕێگای

خۆپەرستیو داکۆکی کردن بە تەنیا لەسەر قازانجی خۆیان •

خۆ نەبەستنەوەو دورەپەرێز وەستان لە سیاسەت تای مەسەلە نیشتمانیو چینایەتیو کۆمەلایەتییەکان بە باری قازانجی کۆنە پەرستاندا ئەشکێنێتەوە • چونکە ئەندامانی کۆمەڵ لە خەباتی سەرجەمی خەڵك دابڕ ئەکاتو خەڵك لە بەشداریکردنی داخوازی نیشتمانیو چینایەتی دور ئەخاتەوە •

لە واقیعدا زۆر ستەمە یەکێك بیەوێ لە کۆمەڵگادا بژیو لە سیاسەت دورە پەرێز بێت ، دورە پەرێز وەستان لە سیاسەت خۆی لە خۆیدا خزمەت بە دەستەلاتی دژی خەڵکی ئەکاتو ئەم هەلوێستە ئەبێتە سیاسەتێکی زیان مەندانەو کۆنەپەرستانەو دژی خەڵك ••

● **ئۆتۆکراسی** Autocracy

**بەو دەسەلاتدارییە ئەوترێ کە ئەم خاسیەتانەی تیا بێت :**

أ ــ فەرمانکردنی یەکێك بەسەر کۆمەڵێك کاربەدەستی ئیداریدا

ب ــ یاسایەك یان نەریتك نەبێت کە چاودێری کاروباری فەرمانڕەواکان بکات •

ج ــ دەسەلاتی فەرمانڕەوا لە هەر کاروبارێکدا کە بیەوێ بیکات بێ سنور بێت •

تاکە کەسێکی خاوەن دەسەلات « ئۆتۆکرات » رەنگە بێ دەسەلاتی خۆی لە رێگای بڕیاردانو یاسای کۆمەلایەتییەوە گرتبێتە دەست ، وەیان بە زۆر بەدەستی هێنا بێت ، کە لە شێوەی یەکەمدا ئۆتۆکراسی

ڕەوایەو لە شێوەی دووەمدا دیکتاتۆری‌یە •• دەسەڵاتدارە سەڵتەنەتیەکان جۆرە حکومەتێکی ئۆتۆکراتین •

## ● ئیرتیجاع Reaction

لە مەفهومی سیاسی‌دا ئەم زاراوەیە بە مانا پێچەوانەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەگرێتەوە ، بەربەرەکانێی کرداری پێشکەوتوانەی چین‌و توێژەکانی کۆمەڵە •

ڕێڕەوی حەتمیگیری مێژوو ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵك ، کۆمەڵگای ئادەمیزاد بەرەو پێشکەوتن‌و گەشەکردن ئەبات •• ئەو چین‌و توێژانەی لە کۆمەڵدا حوکمفەرمان لەگەڵ ئەو ڕێبازە پێشکەوتوانانەدا ناگونجێن‌و ئەیانەوێ دۆخی کۆن وەکو خۆی بهێڵنەوە ، چونکە گۆڕان‌و پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەوان بەرەو نەمان ئەبات ، وەکو : لەناو چونی کۆمەڵگای کۆیلەیێتی ، دوای ئەوان خاوەن مڵکەکان « فیودال » ئینجا سەرمایەدارەکان •• ئەم چین‌و توێژانە لە پێناوی مانەوەی خۆیان‌و پاراستنی قازانجی خۆیانا هەمیشە بەربەرەکانێی پێشکەوتنی کۆمەڵ‌و گەشەکردنی چیەکانی کۆمەڵ ئەکەن •

کەوابو « ئیرتیجاع » بە مانا داکۆکی کردنە لەسەر ڕێژیمی گەندەڵ ، واتا بەربەرەکانێی پێشکەوتنە •

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا ، لەو وڵاتانەی کە لە بواری سنعەتدا پێشکەوتوون ، فاشیزم و میلیتاریزم لە ریزی پێشەوەی کۆنەپەرستان واتە « ئیرتیجاع » ئەوەستن •

ئیرتیجاع ـ کۆنەپەرست ، بەو کەسانە ئەڵێن کە بەربەرەکانێی هەموو هەنگاوێکی پێشکەوتوانە ئەکات‌و بەرەنگاری هەموو کردارێکی

تازە ئەوەستێ •• هەوڵ ئەدات ڕیژیمی کۆنەو گوندەڵ بە حوکمی بیری کۆنەپەرستانەی خۆی بپارێزێ •

### ● ئاریستۆکراسی Aristocratie

ئەم زاراوەیە بە مانا دەستەی پیاو ماقوڵان ئەگرێتەوە ، بەو توێـژو کۆمەڵانە ئەڵێن کە دەستەڵاتێـکی زۆریان هەیە ، سامانو توانای دەستەڵاتیان زۆرە ، پایەو پلەی کۆمەڵایەتی‌یان لەناو خەڵـکدا بەرزە ، ئەمانە هەوڵـی ئەوە ئەدەن ئەو پلەو پایەی هەیانە بیپارێزنو بە میـرات لە یەکتـر وەری بگرن • ئەسڵی ئەم زاراوەیە بەو کۆمەڵە خەڵـکانەیان ئەووت کە لە کۆتایی کۆمەڵـگای کۆمونی سەرەتایدا خاوەن سامانو دەسەڵات بون • وە یان بە سەرکردەی خێڵو فەرماندەکانیان ئەوت ، کە دەسەڵاتـدار بـون • کەوابو ئاریستۆکراسی لە سەردەمی سیستەمی « باوك ســالاری »[1] دا پەیدا بووە •• لە کۆمەڵـگای کۆیلەییدا بە دەوڵەمەند ترین بنەماڵەیـان ئەووت کە کۆیلـەو زەویو زارێـکی زۆری هەبایـە ، لە کۆمەڵـگای دەرەبەگایەتیشدا « فیودالی » بە خاوەن زەویو زاری زۆرو بە دەسەڵاتیان ئەووت ، کە لە دەزگاکانی دەوڵەتدا شوێنو پایەی بەرزیان بوبێت • کـە ئەمانەش هەموی بە میرات لە یەکترەوە وەر ئەگیران •

یەکەمین شۆڕشی بۆرجوازی لە دژی ئاریستۆکراسی‌یەکان کرا ، کە لە زۆر شوێنو دەوڵەتدا دەسەڵاتی سیاسی‌یان لە دەست وەرگیرا ، وە لە زۆر وڵاتانی تریشدا دو چینی چەوسێنەرەوە ، بۆرجوازیو فیودالـە ئاریستوکراتەکان ڕێکەوتن کە پێکەوە بەشداری دەوڵەت بکەن •

---

(١) ئـەو سیتەمـە کۆمەڵایەتی‌یە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی خێزان لـــە ئەستۆی باوکاندایە کە « پـدر سالار » پـێ ئەوترێ •
**وەرگێر**

له ئەنجامی گەشە کردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا گەلێك لـە ئاریستوکراتەکان خۆیان تێـکەڵ بە هەل‌و مەرجی تازە کردو هەمویان بونە سەرمایەداری گەورە •

بە مانای گشتی ئاریستوکرات توێژە دەسەڵاتدارەکانی سـەرەوەی کۆمەڵن • « ئاریستوکراتی کرێـکاران »یش ، زاراوەیەکە بەو کۆمەڵـە کرێـکارە ئەڵێن کە لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا دەستیان بە سەر قازانجی زۆردا گرتووەو خۆیان لە کۆمەڵانی تری کرێـکاران جیا کردۆتەوە • ئەوانە نوێنەری دەسەڵات‌و ئایدیۆلۆجی‌و قازانج‌و سیاسەتی سەرمایەدارانن لەناو پرولیتاریادا •

● **ئیستیبداد ـ ئەپسۆلۆتیسم** Apsolutisme

**بونیاتنانی سیاسی‌یە کە ئەم تایبەتیانەی تیا بێت :**

أ ـ دەسەڵاتی دەوڵەت هیچ سنورێـکی یاسایی یان نەریتی بۆ دانەنرێت ••

ب ـ فراوانبونی شـیرازەی حوکـم‌و بەسـتنەوەیان بە دەزگای ئیداری ناوەندەوە •

**ئیستبداد ، ئوتوکراسی ، دسپۆتیزم ••**

ئەمانە لە مەفهومدا یەك ئەگرنەوە ، بەڵام لە سروشتدا وەکو یەك نین ، هەروەوکو چۆن توتالیتریزم جۆرێـکە لە ئیسـتیبداد بـەڵام هەمـو ئیستیبدادێـك توتالیترنیە •

لە جیهانی کۆندا چەندان دەوڵەتی خاوەن شارستانێتی کۆن هەبووە ، وەکو : ئاشور ، بابل ، میسر ، ئیران‌و ••• کە ئەمانە سەرجەم دەوڵەتـی

ئیستیبدادی بون . تەنیا یۆنانو رۆم نەبێت کە تەنیا دیکتاتوری کاتی یـان هەبووە .

لە سەدەی شازدەیەم بە دواوە ئیستیبداد لە ئەوروپا روخسارێـکی تازەی بە خۆوە گرت . ئەوەش لە کاتێـکدا بو کە دەوڵەتە گەلی‌یەکانو پادشایان بەرامبەر بە دەسەلاتی « پاپ » راست بوونەوەو ئیستیبداد وەکـو رێبازێـکی سیاسی لێ هاتو دەوڵەتە گەلی‌یەکانی یەکخستو بە شێوەیەکی تازە رێـکی خستن .

**بۆ نمونە ، لویسی چواردەیەم کە گوتی :**

« من دەوڵەتم » ئەوە نمونەی ئیسـتیبدادی سەدەکانـی حەفـدەو هەژدەیەم بو ، چونکە دەسەلاتێـکی بێ سنوری هـەبو .. لە سـەدەی هەژدەیەمدا شورشەکانی ئەمەریکاو فەرەنسە بە ئیستیبدادەوە راپەرین . ئەم راپەرینە لە ماوەی سەدەکانی نۆزدەیەمو بیستەمدا بو بە هۆی هاتنـە کایەی چەندان دەوڵەتی یاسایی لە سەرتاسەری جهاندا ، وە لـە هەمان کاتا لە سەدەی بیستەمدا جۆرە ئیستیبدادێـکی تازە پەیـدا بو کە پـێ‌ی ئەوترێ « **توتالیتریزم** » .

● **ئیستیثمار** Exploitation

زاراوەی ئیستیثمار لە وشەی « ثەمەر »ەوە هاتـوە ، بـە فارسـی بەهرەکەشی واتا سود لێ وەرگرتنە .. لە بواری ئابوری‌و کۆمەلایەتیدا مانای سود وەرگرتن لە کاری کەسێـکی تر ئەگرێتەوە . مانای زانستیانەی ئیستیثمار بەمجۆرەیە :

به دەست هێنانی بەرهەمی کاری بەخۆڕایی کەسێك لەلایەن یەکێکی تری خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنانەوە ، لە بواری ئابوریشدا بە دەست هێنانی بەرهەمی کار کردنی زیادەو هەندێک کاتی ئیشکردنی دیاریکراو ، لە کاتی بەکار هێنانی ئەم زاراوەیەدا ئەڵێن دەسکەوتی کەسێك لەبەر هەمی رەنجی کەسێکی تر •

ئیستیثمار ، وشەیەکی گشتی هەمو کۆمەڵگا چینایەتیەکانە ، دیسانەوە ئەو چینە خاوەن هۆیانەی بەرهەم هێنانن کە ئەندامانی چینەکانی تر ئەچوسێننەوەو بەرهەمەکانیان ئەبەن ، کەوابو هۆی ئیستیثمار بریتی‌یە لە ملکداریتی تایبەتی‌و خاوەنداریتی هۆیەکانی بەرهەم هێنان •• بەلام شێوەکانی ئیستیثمار پابەندە بە خاسیەتی ئەو ریژیمانەوە کە خاوەنی بەرهەم هێنانن لە کۆمەڵگادا •

بەهرە وەر گرتنی کەسێك لە کەسێکی تر پێویستی بوونی ئادەمیزاد نیە ، وە لە سەرەتای پەیدا بوونی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا ئەمکارە نەبووە ، دیسان بەردەوامیش نامێنێتەوە • ئیستیثمار لە یەکەمین رۆژگاری کۆمەلایەتی ئابوری [ واتا کومونی سەرەتایی ] دا نەبووە • بەلکو لە قۆناغی لەناو چوونی ئەو سەردەمەدا پەیدا بووە •

### ● ئیستیعمار Colonisation

ئیستیعمار بە سیاسەتی دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان ئەڵێن ، کە ئامانجی چەوساندنەوەو سود وەرگرتن بێت لە خەڵکی ولاتانی تر ، خەڵکی ئەو ولاتانەی کە لە بواری ئابوری‌دا هێشتا گەشەیان نەکردوەو بە دوا کەوتویی ماونەتەوە ، دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان بۆ مەحکەمکردنی شیرازەی حوکمو

دەسەڵاتی خۆیان ڕێگا لە گەشە کردنی ئابوریو هونەریو فەرهەنگی ئەو وڵاتانە ئەگرن ، لە سەدەکانی ڕابوردودا ، واتا بەر لە پەیدا بونی ئیمپریالیزم ئیستیعمار چەندان ناوچەو وڵاتی لە ژێر دەستدا بووە • بەڵام ئێمە تەنیا باسی سەدەی بیستەمیان ئەکەین کە خۆی لە خۆیدا ڕوخساری دابەشکردنی وڵاتانی جیهانو دامەزراندنی ئەمپەراتوریو دیاریکردنی ناوچە ژێردەستییەکان ، ئەگرێتەوە ئەمانە ڕوکارو ڕوخساری تایبەتی سەردەمی ئیمپریالیزمن •

**موستەعمەرە :**

بەو وڵاتانە ئەڵێن کە سەربەخۆیی سیاسیو ئابوری نەبێتو لە هەمو کارو بارێکدا سەر بە دەوڵەتێکی ئیمپریالیستی داگیرکار بێت • دەزگا ئینحیسارییە ئیمپریالیستیەکان سود لە کەرەستەی خاوو ئیشکردنی کرێکاران بە هەرزان وەر ئەگرن تیایاو دەست بە سەر بازاڕە کانیشیانا ئەگرنو کەلوپەلی خۆیانی تیا ئەفرۆشنو سەرمایەی خۆیانی تیا ئەخەنە کارەوە • هەروەها زۆر جاریش ئەیانکەنە بنکەو هۆردوگای سەربازی خۆیان •

سیستەمی موستەعمەرەی ئیمپریالیستی : لەناو ئەو ناوچە ژێر دەستانەدا « موستەعمەرە » وڵاتانی نیمچە ژێر دەستەو گرێدراو هەیە کە لە کاروباری هەمە جۆرەی سیاسی یان ئابوریدا هەریەکە بە پێی گرێدراوی خۆی بە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانەوە پابەندی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانن •• [ سیستەمی موستەعمەرەی ئیمپریالیستی ] هەمو ئەو وڵاتە ژێر دەستانە [ موستەعمەرە ] و نیمچە ژێر دەستەو ناوچە گرێدراوانە ئەگرێتەوە کە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان دەستیان بە سەردا گرتوونو سودیان لێ وەر ئەگرن •

ئەم سیستەمە لە قۆناغی دەست بەسەرا گرتنی سەرمایەداریدا پەیدا بووە ، لە سەرەتای سەدەی ئێستادا چەند وڵاتێکی گەورەی ئیمپریالیستی بە هۆی هێزی لەشکرو لژیۆنەکانی دەرەوە وڵاتە ژێر دەستە کراوەکانی جیهانیان لە نێوان خۆیانا دابەشکردبو ، دوای ئەوەش چەند جارێـك بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی وڵاتە ژێردەستە کراوەکان لە نێوان خۆیانـا لێیـان بۆتە مشـتو مڕو زۆر جاریش شـەڕ لە نێـوان هەندێـکیانا هەڵـگیرساوە ، لەم بارەیەوە وتراوە :

« سـەرمایەداری بـە هـۆی هەندێـك وڵاتـی بەنـاو پێشکەوتووەوە بـووە بەسـیستەمێـکی جیهانـی سـتەمو زۆرداریو دەست بەسەراگرتنی دارایی زوربەی خەڵکی جیهان » •

## ● ئابوری سیاسی Economiepolitigue

ئابوری سیاسی ، بریتییە لە زانستی یاساکانی بەرهـەم هێنـانو دابەشکردنی بەروبومی مادی لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی گەشە کردنی کۆمەڵـگای ئادەمیزاددا •

لە رۆژگاری کۆیلەیدا کە ئابوری سیاسی وەکو زانستییەکـی عەمەلی خۆی نواند ماهیەتی چینایەتی دەرکەوت بەو جۆرە کە چینـە دەسەڵاتدارەکان کردیان بە ئایدیۆلۆجی خاوەن کۆیلەکـان بۆ سـود وەرگرتن لە بەرهەمی کۆیلەکان ، بەرەبەرە لەگـەڵ گەشـە کردنـی کۆمەڵو باری کۆمەڵایەتیو ئابوری‌دا ئەهمیەتی زانستی ئابوری بەرەو پێشتر چوو ••

ئابوری سیاسی کلاسیك ، بۆرجوازی ، لەگەڵ گەشەکردنی شێوەی

بەرهەم هێنانی سەرمایەداریدا پەیدا ئەبێت کە ئابوری زانەکانی وەکو [ئادام سمیت](1) و[دیڤید ریکاردۆ]چەندان هەنگاری گرنگیان لە رێگەی زانینی یاساکانی بەرهەم هێنانو دابەشکردنی کۆمەڵایەتیانەی بەروبومی مادی‌یەوە نا •• ئەم بیرو باوەڕە بنچینەکانی زانستی ئابوری سەرمایەداری داڕشت •• ئەم بیروباوەڕە ریژیمی سەرمایەداری بە شتێکی جاویدانی دائەنا •• وە هەر قازانجی بۆرجوازی یەکان بو کە لە سەرەتای رۆژگاری گەشە کردنیا بەربەرە کانێی فیودالیزمی ئەکردو بەسەریا سەر ئەکەوت ، ئەم بیروباوەڕە لە کۆتایی سەدەی حەفدەیەمو سەرەتای سەدەی هەژدەیەمی زاینی‌دا لە بەریتانیا وفەرەنسە دەورێکی بالآی هەبو •

## ● ئابوری سیاسی شورشگیرانە :

لەگەڵ پەیدا بونی چینی پرولیتاریا ئابوری سیاسی شورشگێرانە وەکو هێزێکی چینایەتی سەربەخۆ سەری هەڵدا ، رابەرەکانی راپەڕینی کرێکاران لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری یان لە هەمو لایەنیکەوە خستە بەر لێدوانو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی زانستی‌یانە ، بە هۆی سود وەرگرتن لە عونسورەکانی زانستی ئابوری سیاسی کلاسیکی بۆرجوازی ، ئابوری سیاسی پرولیتاریا یانوەکو زانستی‌یەکی تەواو دەرهێنا •• کە ئێستاش بە بەشێکی گرنگی تیوری هەمەلایەنیانەی شۆرشگێڕانە دائەنرێ ، ئابوری سیاسی شۆرشگێڕانە لە مێژووی ئابووری سیاسی‌دا پەیدا بووە •• ئەم رێبازە زانستی‌یە هەمو مەسەلە بنچینەییەکانی ئابوری رون کردۆتەوەو بەردەوام رون تریش ئەبێتەوە •

ئەم رێبازە پەیوەندی‌یەکانی نێوان خەڵكو چینەکانی کۆمەڵو

---

(1) A-smith

پەیوەندی‌یەکانی ئابوری‌و بەرهەم هێنانی رون کردۆتەوە ، پەیوەندی‌یە بەرهەم هێنەرەکان بە گەورە ترین هۆی بنچینەیی دائەنێ لەناو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا ..

● **ئالیگارشی** Oligarchie

زاراوەی ئالیگارشی لە زوربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا بەکار ئەهێنرێ‌و بە مانا دەسەڵاتداری کۆمەڵێکی دیاریکراو ئەگرێتەوە ، مەفهومی ئەم زاراوەیە دەسەڵاتی سیاسی‌و ئابوری چەند کۆمەڵێك لە خاوەن سامانە بە دەستەڵاتەکانە . شێوەیەکە لە شێوەکانی حکومەتی کردن لە ریژیمە ئیستیثماری‌یەکاندا ، ئەو جۆرە حکومەتانە لە سەردەمە جۆربەجۆرە ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکانی [ کۆیلەداری‌و فیودالی‌و سەرمایەداری ] دا هەبوە . ئەو کاتە بووە کە تاقمێك خاوەن سامان‌و بە دەستەڵات هەمو هۆیەکانی بەرهەم هێنانیان گرتبوە ژێر دەستی خۆیان‌و حوکمیان بەسەر کۆمەڵانی خەڵكدا کردوە . ئەمەیە ماناو مەفهومی گشتی ئالیگارشی .. ئەم وشەیە لە زمانی یۆنانی [ئولیگارکیا] وەر گیراوە ، کە لە سەردەمی کۆنی یۆناندا بە مانای حکومەتی تاقمیکی کەمیان وتوە .. تاقمیك لە توێژەکانی سەرخای کۆمەڵ‌و دەوڵەمەندە دەسەڵاتدارەکان بووە .

● **ئالیگارشی مالی :**

ئەم زاراوەیەش زۆر جار بە کار ئەهێنرێ واتە سەربەخۆیی سیاسی‌و ئابوری کۆمەڵە سەرمایەدارێکی گەورەی خاوەن پارە .. چەندان کومپانیای ئینحیساری‌و سنعەتی‌و بانقیان بە دەستەوە بێت . چاودێری لقە بنچینەیەکانی ئابوری بکەن ، بەم واتایە ئالیگارشی مالی لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا ئەبێت ، واتە لە قۆناغی بالآ ترین پلەی گەشە کردنی

سەرمایەداری‌دا ، ئالیگارشی مالی دیسان بە دەسەلاتی ئابوری‌و سیاسی سەرمایەدارە گەورەکان ئەلێن لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا ، لە کاتێکدا کە چەند کومپانیایەکی ئینحیساری زۆر گەورە دەست بەسەر هەمو بەشە ئابوری‌یەکانی سەرمایەداری‌دا ئەگرن • وە لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی سەرمایەی سنعەت‌و ئیحیساری‌و سەرمایەی بانقەکان « سەرمایەی مالی » پەیدا ئەبێت •

## نمونەیەکی ئالیگارشی مالی :

لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا کۆمەڵێك دەوڵەمەندو خاوەن کارخانەو پارەو دەزگای ئینحیساری وەکو مورگان‌و دوپن‌و روکفلەر دەسەلاتیان بەسەر هەمو ئابوری‌و سیاسەتی ولاتدا گرتووە •

لە ئەمەریکادا ، ئەمانە بە ٦٠ شەست بنەماڵەی گەورە ناسراوون ، بەلام لە واقیع‌دا لە ٩ نۆ کۆمەڵ زیاتر نین •• ئەمانە هەمو شیرازە بنچینەییەکانی ئابوری‌و سیاسەتی ناو خۆو دەرەوەو چاپەمەنی‌و هۆیەکانی راگەیاندن‌و دەزگا دەوڵەتی‌یەکان‌و دانشکاو دەزگاو دامەزراوە هونەری‌و تەکنیکی‌یەکانیان بە دەستەوەیە •

بنەماڵەی مورگان ١٢ دوازدە دەزگاو دامەزراوی گەورەی وەکو : بانقەکان ، دەزگای سنعەتی ، گواستنەوەو بارکردن ، دەزگای سەربازی ، لەگەڵ سامانێکی زیاتر لە پەنجا ملیارد دۆلاری‌یان بە دەستەوەیە • هەروەها بنەماڵەی روکفلەر ٩ نۆ دەزگای گەورەی سنعەتی نەوتی‌و بانق‌و سەرمایەی چل ملیارد دۆلاری هەیە ، بنەماڵەی دوپن پیشە سازی کیمیایی‌و کارخانەی ئوتومبیل سازی هەیە • بنەماڵەی فورد سنعەتی ئوتومبیلیان

هەیە ، لە فەرەنسە ئەم ئالیگارشی‌یە نزیکەی ۲۰۰ دوسەد بنەماڵەی ناسراوون کە سەرمایەی ئینحیساری بانق‌و سنعەتی فەرەنسەیان بە دەستەوەیە .

روتشیار ، وندل ، شنایدر ، دامسو ، مالە ... ئەمانە بەناوبانگترین بنەماڵەی ئالیگارشی مالی فەرەنسەن .. ئالیگارشی مالی جگە لە دەست بەسەرا گرتنی ئابوری وڵات سود لە سنعەتی کەرەسەی جەنگی وەر ئەگرێ‌و دەست بەسەر دەزگا دەوڵەتی‌یەکانی وەکو راگەیاندن‌و فێرکردن دا ئەگرێ .. تەنانەت پەل بۆ سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی وڵاتانیش ئەکوتێ .. لە کاتی دەسەڵاتداریتی ئالیگارشی مالی‌دا ئازادی‌یە دیموکراتیەکانی بۆرجوازیش ئەچەوسێنەوە . دەسەڵاتی دەوڵەت ئەکەوێتە دەست توێژێکی زۆر بە دەسەڵاتەوە کە پێی ئەڵێن پلۆتۆکراسی(۱) .

● **ئیمپریالیزم** Imperialisme

باڵاترین‌و دوا قۆناغی سەرمایەداری‌یە ، ئەم قۆناغە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم‌و سەرەتای سەدەی ئێستادا « بیستەم » پەیدا بووە .. زانایان لە تیوری ئیمپریالیزم کۆڵاونەتەوەو روخساری تایبەتی ئیمپریالیزمیان داوەتە بەر سەرنج‌و لەم خاڵانەی خوارەوەدا شی‌یان کردۆتەوە :

۱ ـ کۆ کردنەوەو زۆر بونی بەرهەم‌و سەرمایە بوو بە هۆی پەیدا بوونی دەزگا ئینحیساری‌یەکان

---

(۱) Plutocratie

« مونۆپۆلەکان » • دەزگا ئینحیسارییەکان لە قۆناغی خۆیاندا رۆڵێکی گەورە لە ژیانی ئابوریدا ئەگێرن •

٢ ـ لێدانو تێکەڵکردنی سەرمایەی بانقەکانو سەرمایە سنعەتییەکان بوو بە هۆی پەیدا بونی سەرمایەی مالیو ئالیگارشی مالی •

٣ ـ خستنە کاری سەرمایە لە جێگای خستنە کاری کەلوپەل ئەهمیەتێکی تایبەتی بۆ خۆی پەیدا کرد •

٤ ـ پەیدا بونی یەکێتییەکانو کونسرنە ئینحیسارییە سەرمایە دارییەکان • ئەم یەکێتییانە وەکو کارتلەکان ، تراستە کان ، کونسرسیومەکان ••• جیهان لەروی ئابورییەوە لە نێوان خۆیانا دابەش ئەکەن •

٥ ـ کۆتایی دابەشکردنی ناوچەو سەرزەمینەکانی جیهان لە نێوان گەورەترینو دەوڵەمەند ترین دەوڵەتە سەرمایە دارییە کاناو سەرەتای دابەشکردنەوەی سەر لەنوێی ناوچەکانی جیهان لە نێوانیاندا •

بنچینەی ئابوری خاسیەتی تایبەتی ئیمپریالیزم بریتییە لە دەسەڵاتدارێتی دەزگا ئینحیسارییەکان •• دەزگا ئینحیسارییەکان هەمو شیرازەو لایەنە ئابوریو سیاسیەکانی گەورە ترین وڵاتانی سەرمایەداری ئەگرنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانو بەربەرەکانێی ئازادانە لەناو ئەبەن دەسەڵاتی

دەزگا ئینحیساری‌یەکان لە ژیانی ئابوری‌دا لەگەڵ تواناو دەسەڵاتی ڕۆژانەیان لە زەمینەی سیاسی‌دا هاوتان ، چونکە دەزگاکانی دەوڵەت ئەکێشنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە •

لەم قۆناغەی سەرمایەداریدا ، دەزگا ئینحیساری‌یەکان وەکو ئیمپەراتۆرە بە دەسەڵاتەکان ئەبن لە هەمو کاروبارێکدا ، دیسانەوە زاراوەی ئیمپریالیزم لە وشەی ئیمپریۆ(١) ی لاتینی وەر گیراوە کە بە مانا ئیمپەراتۆر ئەگرێتەوە •

بە کورتی ئیمپریالیزم دوا قۆناغی ژیانی سەرمایەداری‌یە ، ئیمپریالیزم هیلانەی شۆرشی شۆشیالیستیانەیە ، لەم قۆناغەدا ، لەناو هەمو سیستەمە جیهانی‌یەکانی سەرمایەداریدا هەل‌و مەرجی لەبار بۆ شۆرشی کۆمەڵایەتی پرولیتاریا ئەرەخسێ •• ناکۆکی نێوان کارو سەرمایە ، ناکۆکی نێوان دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان‌و وڵاتە ژێردەستەکانیان‌و ئەو وڵاتانەی پێ‌یانەوە گرێدراوون ، ناکۆکی نێوان دەوڵەتە ئیمپریالیستی‌یەکان لەناو خۆیاندا تابێت توندو تیژ تر ئەبێت •• پەیدا بوونی ئەم ناکۆکی‌یە سێ قۆڵی‌یە ئەبێتە هۆی پەیدا بوونی سیستەمی جیهانی سوشیالیستی •

● **ئیمتیاز :** Concession

ئیمتیاز لە ڕیژیمی سەرمایەداریدا بریتی‌یە لەوەی کە سەرمایە دارەکان ، یان دەزگا ئینحیساری‌یەکان مافی ئەوەیان هەبێت بە پێ‌ی هەل‌و مەرجی تایبەتی سود لە هەندێك دەزگاو دامەزراوەکان ، زەوی‌یەکان ، سامانی سروشتی ، کانەکان ، دەریاکان و هەموو کاروبارە ئابوری‌یەکانی تر وەر بگرن • ئەم سامانانە ، ئەم دەزگاو دامەزراوو کاروبارە ئابوری‌یانە

---

(١) Imperiu

هینی دەوڵەت یان پارێزگا یان شارەوانیەکانن ، کە بە هـۆی ئیمتیـازەوە سەرمایەدارانی ناوخۆو دەرەوە سودیان لێ وەر ئەگرن‌و ئەیانگرنە ژێر دەستی خۆیانـەوە .. سـەرمایـەداران‌و دەزگـا ئینحیســاری‌یە سەرمایەداری‌یەکان بۆ بە دەست هێنانی کەرەستەی خاوو دەست گرتن بەسەر ئابوری وڵاتدا ، بۆ بەرهەم هێنانی بێ بەزەییانەو چەوساندنەوەی کرێـکارانی ناوخۆو دەست گرتنی بەسەر سیاسەتی وڵاتـدا سـود لـە ئیمتیاز وەر ئەگرن . لـە قۆناغی ئیمپریالیزمدا ، وەرگرتنی ئیمتیاز لـــەو وڵاتانەی کە بە ئیمپریالیزمەوە گرێدراوون بایەخێـکی زۆری هەیە .

● **ئانارشیسم** Anarshisme

رێبازێـکی سیاسی ئاژاوەچی‌یانەیە کـە لە گـەڵ ئاوات‌و قازانجی چینی کرێـکارو هەمو زەحمەتکێشاندا ناگونجێت . لە رووی چینایەتی‌یەوە تابعیکی وردە بۆرجوازی‌یانەی هەیە ، لەبـاری سەرنجـی سیـاسیشـەوە کۆنەپەرستانەیە .. چونکە لە پێناوی گەشە کردنی کۆمەڵدا نیە .

ئەم زاراوەیە لە وشەی « ئانارخیا »ی یۆنانی یەوە وەرگیراوە کە بە مانا نەبوونی رابەرو حکومەت ئەگرێتەوە ، ئانارشیستەکان دەوڵەتـی پرۆلیتاری‌یان لە هەر هەل‌و مەرجێـکی کۆمەلایەتی دا ناوێت‌و حـزب‌و رێـکخستن‌و رێبازی سیاسیانەو بەرنامەی کاری هەر حزب‌و رێـکخراوێك بە پێویست نازانن .

لە راپەرینی شۆرشگێرانەدا ئەوانەی لایەنگری ئانارشیسم ئەکەن بەربەرەکانێی رابەری راپەرینەکەو ئایدیۆلۆجی کۆمەڵە راپەریوەکـە ئەکەن . ئەوانە بە بیانوی ئەوەی کە ئینسان ئازادە تەنیا کاری تاکە کەسی

یان بەلاوە پەسەندە ، کاری جەماوەرانەو خەباتی چینایەتیانەو راپەڕینی کۆمەلآیەتیانە بە هیچ دائەنێن ..

ئانارشیسم ، هەمیشە بەربەرچی راپەڕینی خەڵكو یەکێتی نێوان کۆمەلآنی خەڵك ئەداتەوە . هەوڵ ئەدات چینی کرێکار لەسەر پەیامی مێژوویی خۆی بگێڕێتەوە دواوە ، لە جیاتی رێکخستنو یەکگرتن دوبەرەکایەتیو ئاژاوە ئەنێتەوە . ئانارشیسم وەکو رێبازێکی سیاسیانە ماوەی ١٠٠ تا ١٣٠ ساڵ لەمەوبەر(١) لە ئەوروپا پەیدا بو ، کەسانی وەکو ماکس ئاشتیرنر(٢)و پرودونو باکونین(٣) رابەرییان ئەکرد .

دانەرانی تیوری سوشیالیستی زانستی بۆ دروست کردنو دامەزراندنی رێکخراوی سیاسی کرێکاران گەلێك لەگەڵ نوێنەرانی ئەم رێبازەدا کەوتنە مشتو مڕەوەو گەلێك بەربەرەکانێ یان کردن .. لەم روەوە وتویانە :

« ئانارشیستەکان ، چینی کرێکار بۆ سەرمایەدارەکان دەستەمۆ ئەکەن ، جگە لە چەند وشەیەك لە بارەی بەرهەم وەرگرتنەوە هیچی تریان فێر ناکەن ، ئەویش بێ ئەوەی لە ریشەو هۆیەکانی بگەن ، باوەڕیان بە خەباتی چینایەتیانە نیە » .

● **ئاندیڤیدۆ ئالیسم** Indivdualisme

ئەم زاراوەیە ، لە وشەی ئەندیڤیدۆ(٤) وەر گیراوە کە لە زوربەی

---

(١) **واتە لە کاتی سەردەمی نوسینی ئەم کتێبەوە**

(٢) M - Stirner

(٣) Bakunin

(٤) Indivdu

زمانه ئەوروپاییەکانا بە مانای تاك یان تاکە کەس هاتووە ، بەو شێوەیە رێبازی ئاندیڤیدۆئالیسم بە رێبازی تاکە کەسی ناو ئەبرێ کە ئەمەش لە خاسیەتەکانی ئایدیۆلۆجی گیانی وردە بۆرجوازی‌یە ، وە لە هەمو ئەو روحیەتانەی کە لە کۆمەڵدا ملکداریتی تایبەتی پەسەند ئەکەن خۆی ئەنوێنێ ..

بەکورتی مانای بایەخدان بە تاکە کەس ئەگرێتەوە تاکو کۆمەڵ . دیسان مانای رەسەنیەت‌و ئەهمیەتی تاکەکەسە بەسەر زوربەی کۆمەڵدا .. دروشمی ئاندیڤیدۆ ئالیستەکان بەمجۆرەیە :

« **یەکەم تاکە کەس ئینجا کۆمەڵ** » ..

هەمو فەلسەفە هاوچەرخەکانی سەرمایە داری کە لە هەموو مەسەلە بنچینەیی‌و فەلسەفی‌و کۆمەڵ شوناسی‌یەکان کۆڵاونەتەوە ، هەمویان لەسەر بنچینەی فەلسەفەی بە رەسەنیەت ناسینی تاکە کەس دامەزراوون .

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە « رەسەنیەتی کۆمەڵ » یان « رێبازی دەستە جەمعی » تیوری‌و عەمەلی‌یە کە بە پێی ئەو رێبازە رێزی قازانجی گشتی ئەدات بەسەر قازانجی تاکە کەسدا رێبازی رەسەنیەتی کۆمەڵی سوشیالیستی لەسەر ملکداریتی هەرەوەزی‌و هۆیەکانی بەرهەم هێنان دامەزراوە .. بە بێ رێبازێکی ملکداریتی هەرەوەزی‌و کۆمەڵگایەکی سوشیالیستی هیچ هەل‌و مەرجێکی واقیعی بۆ پەروەردە کردنی هەمو لایەنەکانی کۆمەڵ لەگەل گیانی هەرە وەزی‌دا نایەتە دی و پەیوەندی هاریکاری ناتوانێ جێگای پەیوەندی‌یە کانی ستەم بگرێتەوە .

## ● ئەنتەر ناسیونال International

زاراوەی « ئەنتەر ناسیونال »بە مانا « نێونەتەوەیی »یە ، بەو رێکخراوە کرێکاری‌یە جیهانی‌یە وترا کە لە کۆتایی سەدەی رابوردودا تا ناوەڕاستی سەدەی ئێستا لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی گەشە کردنی کۆمەڵدا دامەزرا ..

بنچینەی یەکەمین کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کرێکاران کە لە دوایدا بە ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم ناوبرا لە ساڵی ١٨٦٤ دا لەلایەن مامۆستایانی پرۆلیتاریاوە دانرا . ماوەیەکی زۆر بو هەوڵی دامەزراندنی رێکخراوێکی شۆرشگێرانەی چینی کرێکاران ئەدرا ، ئەنتەرناسیونال وەکو رێکخراوێکی نێونەتەوەیی پرولیتاریاو نمونەی سەرکەوتنی ئامۆژگاریەکان لەناو راپەڕینی چینی کرێکاراندا لە سەدەی رابوردودا سەری هەڵدا . لە ئەنجامی گەشەکردنی سەرمایەداری لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەیەمدا و راپەڕینی چینی کرێکارانو هاتنە پێشەوەی سیستەمی دیموکراتێک لە زوربەی وڵاتە پێشکەوتووەکانا پێویستی هاریکاریو یەکگرتنی چینی پرولیتاریا ، رێکخراوی نێو نەتەوەیی کرێکاران وەکو پێویستی‌یەکی مێژوویی هاتە کایەوە .

ئەنتەر ناسیونالی یەکەم لە ٢٨ی مانگی ئەیلولی ساڵی ١٨٦٤ لە لەندەن دامەزرا.بەیاننامەی ئەو دامەزراندنە بو بە بەرنامەی پرولیتاریای شورشگێر لە سەدەی نۆزدەیەمدا . لەو بەیاننامەیەدا ئەرکی لەناوبردنی دەسەڵاتی سەرمایەداریو جێگیر بونی حکومەتی کرێکاران لە رێگای راپەڕینی سیاسی‌یەوە کەوتە ئەستۆی کرێکاران .

رێکخراوە کرێکاری‌یەکانی ئەو رۆژگارە وەکو لقی ئەم رێکخراوە نێو نەتەوەیی‌یە لە وڵاتەکانی ترا پێک هاتن . لە ماوەی کەمتر لە دو

ساڵ نزیکەی ٢٥ بیستو پێنج رێکخراوی کرێکاری لە زوربەی وڵاتەکانی ئەوروپاو کیشوەرەکانی ترا دامەزران • کتێبی سەرمایە « کاپیتال » لە ساڵی ١٨٦٧ دا لە بارەی رێکخراوە کرێکاری یەکانەوەو گیانی شۆرشگێرانەو سەرکەوتنی سوشیالیزمەوە دانرا • گرنگترین کۆنگرەکانی ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم لە ساڵی ١٨٦٦ەوە هەر ساڵی جارێك وهەر جارەی لەشارێك وەکو شارەکانی جنیف ، لۆزان ، بروکسەل ، بازل ••• بەستران ••

ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم لە دژی ئانارشیسم کە لە ئەسپانیاو ئیتالیا لایەنگریان هەبو کەوتە چالاکی نواندن ، مامۆستایانی ئەم رێبازە ماهیەتی دژی پرولیتاری‌و گێرە شێوێنی ئانارشیسمیان ئاشکرا کردو سەرکەوتنی سوشیالیزمی زانستی‌یان مسۆگەر کرد •

لە کاتی راپەرینی کۆمونی پاریس‌دا ، ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم گەلێك چالاکی نواندو پشتگیری لەو راپەرینە قارەمانانەی کرێکارانی پاریس کرد • لە دوای تێکشکانی کۆمونی پاریس گەلێك چالاکی لە دژی تیرۆری خوێناوی بۆرجوازی فەرەنسە نواند •• هەروەها لە دوای تێکشکانی کۆمونی پاریس لە هەمو وڵاتەکاندا چون بەگژ ئەنتەرناسیۆنالی یەکەمدا • عونسورە راپراو روخاوەکان دورە پەرێز وەستان‌و کەنارەگیری‌یان کرد • بەرەبەرە چالاکی ناوەندی کاری ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم لە ئەوروپادا نەما • بەمجۆرە لە ساڵی ١٨٧٢ لە کونگرەی لاهای بریار درا کە ناوەندی ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم بگوێزرێتەوە بۆ نیۆیۆرك • چوار ساڵ دوای ئەوەش لە کۆنفرانسی « فیلادلفیا » دا ئەنتەر ناسیۆنالی یەکەم بە رەسمی هەڵوەشایەوە •

**ئەنتەر ناسیۆنالی دووەم :**

وەکو رێکخراوێکی نێو نەتەوەیی رێکخراوە سوشیالیستی‌یەکان لە ساڵی ١٨٨٩ لە کونگرەیەکدا کە لە پاریس بەسترا ، دامەزرا لەو رێکخراوەدا حزبە کرێکاری‌یەکانی نزیکەی هەمو وڵاتە ئەوروپاییەکان‌و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئەرجەنتین بەشدار بون . ئەنتەر ناسیۆنالی دووەم لە ماوەی شەش ساڵی سەرەتایی دامەزراندنیا کەلێك یارمەتی بیروباوەڕی شۆرشگێڕانەو پێشکەوتووانەی سوشیالیستی زانستی‌و بەهێز کردنی حزب‌و رێکخراوە کرێکاری‌یەکانی جیهانی دا . ئەو رێکخراوانە بەرەبەرە بونە هێزێکی سیاسی گرنگ لە زوربەی وڵاتە ئەوروپاییەکان . پاش ماوەیەك رابەری کردنی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم کەوتە دەست ئەپۆرتۆنیستەکان . ئەمانە بوونە هۆی ئەوە کە بیروباوەڕو شێوازی بۆرجوازی‌یانە لەناو راپەڕینی کرێکاراندا بخولقێ‌و بەهێز بێت . بەڵام لە ناو ئەوانەدا هەندێك رێکخراوو گرۆی سیاسی خۆیان بە تیوری شۆرشگێرانەوە بەستەوەو بە توندی کەوتنە بەربەرەکانێی رەووشتی خۆبەدەستەوەدەرانەو هەڵوێستی ریفۆرمیستانەی رابەرە ئەپۆرتۆ نیستەکان .

ئەم بەربەرەکانێ‌یە ، بوو بە هۆی جیا کردنەوەی باڵێکی چەپی شۆرشگێڕ لەناو ریزەکانی ئەنتەناسیۆنالی دووەمدا . زوربەی رابەرەکانی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم لە دوای هەڵگیرساندنی یەکەمین جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤دا بە ئاشکرا بوونە پاشکۆی بۆرجوازی وڵاتەکانی خۆیان .. بە تەواوی لە شێوازی هاریکاری‌و پەیوەندی پرولیتاریاو ئەنتەرناسیۆنالیزمی کرێکاران کشانەوە . لەو کاتەدا لەناو ئەنتەرناسیۆنالی دووەمدا سێ رێباز پەیدا بو ، باڵێکی راست یان بڵێین سوشیال

شوڤینستەکان ، ئەویتریان باڵێکی مام ناوەندیرەو ، سێیەمیان ئەنتەرناسیۆنالیستەکان یان بڵێین باڵی چەپ •

لە ساڵی ١٩١٥ لە « تسیمیروالد » لە سویس یەکێتی سوشیالیستەکانی ئەنتەرناسیۆنالیست دامەزرا •

ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم ، لە رێکخراوە شورشگرییەکان پێك هاتووە • لە ساڵی ١٩١٩ تا ساڵی ١٩٤٣ درێژەی بە چالاکی خۆیدا ، ئەنتەرناسیۆنالیستی سێیەم رێکخراوێکی شۆرشگێرانەی نێونەتەوەییو ناوەندی راپەرینی کرێکارانی جیهانبو • یەکەمین کونگرەیان لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩ دا بەست کە نوێنەری رێکخراوە شورشگێرییەکانی ( ٣٠ ) سیی وڵاتی جیهانی تیا بەشدار بو • بۆ یەکەمجار نوێنەری رێکخراوە شۆرشگێرییەکانی وڵاتانی ئاسیا بەشدارییان تیا کرد • بەر لەوە کۆبونەوەیەکی راوێژکاری لە مانگی کانونی دووەمی هەمان ساڵدا کرا کە نوێنەری هەشت رێکخراوی گەورە بەشداری تیا کرد • لەو کوبونەوەیەدا هەمو رێکخراوە شۆرشگێڕیو سوشیالیستییەکانی بۆ کونگرەی ئەنتەر ناسیۆنالیستی •• بانگ کرد • راپەرینی شۆرشگێرانە زۆر بە گورجی لە وڵاتەکانی ئاسیاو ئەوروپاو ئەمەریکادا ریشەی داکوتا و زۆر شوێنو ناوچەی گرتەوە • هەروەها بە هۆی دەوری کاریگەرێتی ئەمەوە چەندان رێکخراوی شۆرشگێڕانەی تر لە وڵاتە جۆربەجۆرەکانی تری جیهاندا دامەزران • کونگرەی دوەمیان لە ساڵی ١٩٢٠ دا بەسترا کە نوێنەری ٤١چلویەك رێکخراو بەشداری تیا کردبو • بڵاوبونەوەی کتێبی « نەخۆشی منالانەی چەپرەوی •••» رۆڵێکی زۆر گەورەی لە بواری رێکخستنو گەڵاڵە گرتنی ئەو کونگرەیەدا گێڕا •• لەکاتی حەوتەمین کونگرەدا کە بە تایبەتی بۆ بەربەرەکانێی فاشیزم لە جیهاندا

ئاراسته کرابو ( ٧٦ ) حەفتاو شەش ڕێکخراوی گەورە بەشدار بون ، کە لەمانە ٢٢ ڕێکخراویان ئاشکراو ٥٤ یان بەنهێنی چالاکی خۆیان ئەنواند . لە پاش هەڵگیرساندنی دووەمین شەڕی جیهانی هەمو ڕێکخراوە شۆرشگێڕی یەکان چالاکی گەورەیان دژی فاشیزم دەست پێکرد .

ئەمەبو بەکورتی مێژوی دامەزراندن و چالاکی ئەنتەرناسیۆنال .

## ● ئەنتەر ناسیونالیستی پرۆلیتاری Internationalisme Proletarion

بریتی یە لە سیاسەت و ئایدیۆلۆجی یەکگرتووی نێو نەتەوەیی کرێکاران و هەمو زەحمەتکێشان . لە باری سەرنجی مێژووەوە بیری ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرولیتاری یەکەمجار لە لایەن رابەرە گەورەکانی چینی کرێکارەوە زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەرەوە[1] دارێژراوە . پایەی تیوری ئەوەبو کە کرێکاران و زەحمەتکێشانی هەر وڵاتێك لە دژی بورجوازی ، لە پێناوی داکوکی لەسەر سەرچاوەکانی ژیانی زەحمەتکێشان ، سەقامگیر بونی دیموکراتیەت و سوشیالیزم ، تێ بکۆشن .. لە هەمان کاتا کرێکاران و زەحمەتکێشانی هەمو وڵاتانی جیهان سەرچاوەکانی ژیانیان یەك ئەگرێتەوەو هەمویان دوژمنێکی هاوبەشی چینایەتی یان هەیە کە ئەویش بۆرجوازی سەرتاسەری جیهانە .

ناوەڕۆك و مەفهومی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرولیتاری لەماوەی ئەم سەد ساڵەی دوایدا ، لە ئەنجامی گەشە کردنی کۆمەڵگای ئادەمیزادو ڕێڕەوی مێژوو زیاتر یەکانگیر بووە ، تاکو سەرەتای سەدەی ئێستا مەفهومی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری بریتی بو لە یەکگرتنی نێو نەتەوەیی زەحمەتکێشانی هەمو وڵاتان لە پێناوی لەناوبردنی سەرمایەداری و

(١) لە سەردەمی نوسینی کتیبەکەوە ..

حکومەتکردنی چینی کرێکار ‎•• دوای ئەوە شێوەو ناوەڕۆکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پڕۆلیتاری بەهێزترو فراوانتر بو •

ئەنتەر ناسیۆنالیزمی پڕۆلیتاری بنچینەی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتە سۆشیالیستییەکانە •

## ● ئینقلاب ـ شۆرش (*) Revolution

شۆرش گۆڕانێکی قوڵی بنەڕەتیو بونیاتنەرانەیە ، سوڕانێکی گەورەو بنچینەیە لە ژیانی کۆمەڵگادا ‎•• شورش لە زانستی کۆمەڵ شوناسیدا بریتییە لە لەناو بردنی ریژیمێکی کۆمەڵایەتی کۆنو رزیوو دانانی ریژیمێکی کۆمەڵایەتی تازەو پێشکەوتوانە لە جێگای ‎•• واتە لەناوبردنی واقیعێکی کۆنو پەك کەوتەو دانانی واقیعێکی تازەو بەکەڵك لە جێگای • بۆ نمونە : شۆرشی گەورەی فەرەنسە کە نزیکەی دوسەد ساڵ لەمەوبەر(١) رویدا شۆرشێکی بۆرجوازییانە بو ، ریژیمی فیودالی رزیوو روخساری سەڵتەنەتی بوربونەکانی لەناو بردو ریژیمی سەرمایەداری ـ کە لەو سەردەمەدا ریژیمێکی تازەو پێشکەوتوانە بوو ـ لە جێگای دانرا • شۆرشی مەشروطەی ئیران شۆرشێکی بۆرجوازییانە بوو ، ئەگەرچی بە نیوەو ناتەواوییانە مایەوەو سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێنا• بەڵام دەستێکی توندی لە سیستەمی سەڵتەنەتیو بنچینەی خانەدانێتیو فیودالی رزیوو وەشاندو رێگای لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەڵو بەشداری کۆمەڵانی خەڵکی لە بواری دیاریکردنی چارەنوسی وڵاتەکەیانا فراوان کرد • شۆرشی ئوکتوبەر شۆرشێکی کۆمەڵایەتیانە بوو ، چونکە ریژیمی کۆنو رزیوی فیودالی و سەرمایەداری لە بنەرەتەوە

---

(*) لێرەدا ئینقیلاب بەمانا شۆرش هاتوە ‎••

(١) لە کاتی نوسینی کتیبەکەوە ‎••

هەڵتەکاندو کۆمەڵگایەکی تازەی سوشیالیستی بونیات نا کـە رووداوێـکی گەورە بو لە مێژووی ژیانی ئادەمیزاددا •

شۆرش گرنگترین قۆناغی گەشە کردنی ژیانی کۆمەڵە ، دووربینیی سیاسیانە شۆرش بە کارێـکی حەتمی ناو ئەو کۆمەڵگایانە ئەزانێت کـە لە چەند چینێـک پێـک هاتوون •• لە هەمو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە چەندان چینی جیا جیاو خاوەن قازانجی جیا جیایان تیایە گەشــە کردنی ئابووریو کۆمەڵایەتی قۆناغ بە قوناغ هەڵو مەرجی گۆڕینی بنەرەتیو بونیات نەرانە ئەرەخسێنێ • لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی گۆڕینی بونیات نەرانەی ریژیمـی کۆمەڵایەتی • لەم روەوە وتراوە :

« هێزە بەرهەم هێنەرەکانی کۆمەڵ لە قوناغێـکی تایبەتی گەشەکردنی خۆیانا لەگـەڵ پەیوەندییەکانـی بەرهـەم هێنـاندا ، واتە لەگەڵ پەیوەندییەکانی مڵـکداریتـی دا کە لە ناو مناڵدانی ئەودا گەشەیان کـردوە ئەکەوونـە ناکۆکییەوە ، پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان ئەبنـە کۆسپو بەرهەڵست لە رێـگای گەشە کـردنی هێـزە بەرهەم هێنەرەکاندا ، وە لەو کاتەدایە کـــە قۆناغی شۆرشی کۆمەڵایەتی دەست پێ ئەکات » •

شۆرش هەمو ئەو ناکۆکیانە چارەسەر ئەکات کە باس کران ، ئەو پەیوەندییە کۆنانەی بەرهەم هێنان لەناو ئەبات ، پەیوەندی تازە سەقامگیر ئەکاتو ئەبێتە هۆی خۆشکردنی زەمینەی بە پەلە گەشە کردنـی هێـزە بەرهەم هێنەرەکان •• ئەمەیە پایەی ئابووریو واقیعی شۆرش •

شۆڕش چینێـکی فەرمانڕەوا لـەناو ئەباتو چینێـــکی تر کـە لـە

بواری پەیوەندی بەرهەم هێناندا پێشکەوتوانە ترن لە جێگای دەسەڵات دای ئەنێت • ئەتوانین بڵێین کە شۆرش دەوڵەتێکی تازەو پێشکەوتو تر لە جێگای دەوڵەتێکی کۆنو دوا کەوتو دائەنێت ••

..مەسەلە بنچینەییەکانی هەر شۆرشێك بریتی‌یە لە دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت گرتنە دەست • وەر گرتنی دەسەڵات لە دەست چینێکی دەسەڵاتداری دوا کەوتووانەو سپاردنی بە دەست چینێك یان چەند چینێکی پێشرەوو پێشکەوتوو •• ئەمە ناوەرۆکی بنچینەیی هەر شۆرشێکە •• شۆرش بەرزترین شێوەی راپەرینی چینایەتی‌یە ، چینە پێشکەوتووەکان لە رێگای شۆرش‌و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی چینی فەرمانرەوای کۆنەپەرستەوە رێگای گەشە کردنی کۆمەڵ ئەکەنەوە •

شۆرشی کۆمەڵایەتی قوڵترین گۆرین لە بواری سیاسی‌و ئابوری‌و ئایدیۆلۆجی کۆمەڵدا پێك ئەهێنێ • لە بنەرەتەوە روخساری کۆمەڵ ئەگۆرێت • ئاشکرایە هەندێك گۆران یان کرداری چارەسەریانە « ریفورمیستی » یان پێشکەوتوانە لە چوار چێوەی ریژیمیکی کۆمەڵایەتی دیاردا ، یان لەناو دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتێکدا یان چینی فەرمانرەوا ، ئەمە نابێتە شۆرش • ئەگەرچی دەزگاکانی پروپاگەندەو راگەیاندن هەرچەند بە شان‌و باڵی‌دا هەڵ بخوێنن •

لەو رونکردنەوانەی سەرەوەدا ئاشکرایە کە بە پێی قۆناغی گەشە کردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و راپەرینی چینەکان ئەتوانین چەند جۆر شۆرشی کۆمەڵایەتی دەست نیشان بکەین • وەکو : شۆرشی بۆرجوازی ، شۆرشی بۆرجوازی ــ دیموکراتی ، شۆرشی سوشیالیستی‌و چەندانی تر •• پێویستە ئەوە بزانن کە هەر شۆرشێك چ جۆرە گیرو گرفت‌و ناکۆکی‌یەك لەناو کۆمەڵدا چارەسەر ئەکات •چ ئەرکێکی کۆمەڵایەتی

ئەگرێتە ئەستۆی خۆی ، دەسەلات لەدەست چچینێك وەر ئەگرێتو ئەیداتە دەست چ چینێکی تر ، وە یان شۆرش بە چچینێك ئەسپێردێت • بەم پێیە ئەتوانین جۆری ئەو شۆرشە کۆمەلایەتی‌یە دیاری بکەین • بۆ نمونە : شۆرشی ئوکتوبەر شۆرشێکی سۆشیالیستیانە بو ، شۆرشی فەرەنسەو شۆرشی مەشروطیەت لە ئێراندا ئەمانە شۆرشی بۆرجوازی‌یانە بون •

ئەوەش رون بکەینەوە کە دەسەلاتی دەولەت سەندنەوە لە چینێك و بدرێتە دەست چینێکی تر ئەمە مانای شۆرش نیە ، چونکە بەو جۆرەی کە وتمان مەفهومی شۆرش ئەوەیە ئەو چینەی کە دەسەلات ئەگرێتە دەست لە چینەکەی پێشو پێشکەوتوانە تر بێت • بە جۆرێك کە رێگای گەشە کردنی کۆمەل فراوان بکات • ئەگەرنا ئەگەر چینێکی دۆراوو کۆنەپەرست بتوانێت چینێکی پێشکەوتوو لاببات یان ژێر دەستە بکاتو دەسەلات بگرێتە دەست خۆی ئەوا ئەمکارە کارێکی ناشۆرشگێرانەیەو لە هەمان کاتا دژی شۆرشە •• شۆرش بە بەشداری کۆمەلانی خەلك بە ئەنجام ئەگات • هیچ روخسارێکی لە کودتاو گۆرینی وەزعی دەربار ناچێت • هەر شۆرشێك پێویستی بە زەمینەی شۆرشو هەلو مەرجی شۆرش هەیە وەکو باری شۆرشگێرانەو بوونی رێکخراوێکی شۆرشگێرانە •

● **شۆرشی فەرهەنگی(۱)** Revolutionculturelle

شۆرشی فەرهەنگی بەشێکە لە شۆرشی سوشیالیستی ، مەفهومی راپەرینی خەلكو هێنانەدی فەرهەنگێکی تازەیە ، واتە فەرهەنگی

---

(۱) فەرهەنگ لێرەدا بەمانا کولتورە نەك (قاموس) ••

سوشالیستی‌و هەست پێکردن‌و هەزم کردنی ئەم ئایدیۆلۆجی‌و فەرهەنگە سوشیالیستی‌یەیە لە لایەن کۆمەڵانی زەحمەتکێشەوە •

لە کاتی شۆرشی سوشیالیستیانەدا دەسەڵاتی زەحمەتکێشان سەقامگیر ئەبێت ، هەمو بەرهەمە سوشیالیستی‌یەکان‌و پەیوەندی‌یە بەرهەم هێنەرەکان بە تەواوی تازە ئەبن‌و دەوڵەتی سوشیالیستی دائەمەزرێ • ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوە کە شۆرشی فەرهەنگی سەر بگرێ • فەرهەنگی تازەو سوشیالیستی بە تەواوی سەقامگیر ئەبن •• شۆرشی فەرهەنگی لەم قۆناغەدا گۆرینێکی بونیاتنەرانە بە سەر باری فەرهەنگی کۆمەڵانی خەڵکدا دێنێت • ئەم گۆرینەش لە سەر پایەی توانای تازەی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و هەل‌و مەرجی تازەی مادی‌و سیاسی ئەبێت •

شۆرشی فەرهەنگی چەندان لایەنی هەیە وەکو : کار کردنی پێشکەوتوانەو بێ وێنە لە بواری فێرکردن‌و پەروەردە کردندا ، لەناو بردنی نەخوێندەواری ، سەپاندنی خوێندنی پلەی سەرەتایی بەسەر هەموو خەڵك دا ، پەروەردە کردنی سیاسیانەی خەڵك ، بەرز کردنەوەی ئاستی هۆشیاری سیاسی خەڵك ، پەروەردە کردنی گیانی نوێخوازی ، پێگەیاندنی رۆشنبیری تازە ، لەناوبردنی حاڵەتی دواکەوتنی فەرهەنگی ، زیندو کردنەوەی کەلەپوری هونەری‌و ئەدەبی پێشینان‌و •••• هەروەکو چۆن لە وڵاتە پێشکەوتوەکانا بایەخی پێ ئەدرێت •

**شورشی سوشیالیتی :**

شۆرشی سەرکەوتووی پرۆلیتاریایە کە گۆرانێکی بنچینەیی بونیاتنەرانە لە مێژووی کۆمەڵگای ئادەمیزادا بەدی ئەهێنێ • گەورەترین تۆماری جیهانی کۆنی سەرمایەداری ئەدرێ‌و جیهانی نوێی سوشیالیستی

بونیات ئەنێت • بۆ نمونە وەکو : شۆرشی ئەکتوبەر ، بۆ یەکەمین جار لـە مێژوودا دەسەڵاتی چەوسێنەرەوەکانی لـە بن هێنـاو لـە نـاوی بـردن ، کۆمەڵگایەکی تازەی بێ ستەمی چینایەتی هێنایە کایەوە ، لە ئەنجامـی شۆرشی کۆمەڵایەتیدا یە کە ریژیمی کۆنەو دژی خەڵك جێـگای خۆی بۆ ریژێمیکی تازەی دەست نیشاندەی خەڵك چۆڵ ئەکات • شێوەیەکی تازەی بەرهەم هێنان جێـگای شێوە کۆنەکانی بەرهەم هێنان ئەگرێتەوە •

شۆرشەکانی تاکو سەدەی رابوردو ئەگەرچی رۆڵێـکی دیاریان لە گەشە کردنی کۆمەڵدا ئەگێرا و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان لەچاو رابوردو پێشکەوتوانەتر ئەبوو ، بەڵام لە هەریەك لەم حاڵەتانەدا سیستەمی کۆمەڵایەتی لەسەر بنچینەی بەهرە لەیەکتر وەرگرتن دامەزرا بو • بـۆ نمونە فیودالیزم جێـگای کۆیلەێتی گرتەوە ، سەرمایەداریشـ جیگـای فیودالیزمی گرتەوە • بەڵام لە هەمان کـاتا بنچینـەکانی بەرهـەم هێنـان هەروەکو خۆیان ئەمانەوەو بەهرە وەرگرتن و ستەمی چینایەتی لە هیـچ سەردەمێـکیانا ریشەکێش نە ئەکران •• تەنیا سپاردنی کۆمەڵ بە سیستەمی سوشیالیستی بو کە ئەیتوانی پێـگەیشتوترین هەل و مەرج بۆ گەشە کردن و مانەوەی هێزە بەرهەم هێنەرەکان برەخسێنێ • بەهرە وەرگرتنی کەسێك لە کەسێـکی تر لەناو بەرێت •• زەمینەیەکی بێ سنوور بۆ سەربەسـتی مرۆڤ ، فەرهەنگ و زانستی و هونـەر بێنێتە کـایەوە • ئەمـە قۆناغێـکی ماهیەت تازەو لەروی چۆنایەتیشەوە لە مێژوودا بێ وێنەیە • شـۆرشـی سوشیالیستی چەسپێنەری سەرەتای ئەم قۆناغەیە •

شۆرشی سوشیالیستی ئەهمیەتێـکی گەورەی جیهانی — مێژوویی هەیە ، ئەم شۆرشە بنچینەکانی سەرمایەداری دنیا دێنێتە لەرزین بەشێـکی ئەو جیهانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدا ئەچەوسـێتەوە رزگاری

ئەبێ •• هەوڵو تەقەللای سیستەمی موستەعمەراتی ئیمپریالیزم ئیفلیج ئەکاتو شەپۆلی ڕاپەڕینی کرێکارانو ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلان ئەبنە هۆی بونیاتنانی سیستەمی تازەی سوشیالیستی •

● **ئانکیزیسیون** Inquistion

ئەم وشەیە بە مانا پشکنینی بیروباوەڕ ئەگرێتەوە ، بە دادگا تایبەتیەکانی کلیسای کاثولیکەکان وتراوە کە بە فەرمانی پاپ ئەجولانەوەو ئامانجیان سەرکوتکردنی هەمو ئەو کەسانە بووە کە سەرپیچی یان لە فەرمانەکانی پاپ ئەکرد •• لەو دادگایانەدا هەر ئازادیخواز ، یان پێشکەوتنخوازێکیان بە بیانووی بێ دینو لادەر لە ڕێگای ئاین سزا ئەدا ، ئەیانخستنە زیندانەوە ، ئازاریان ئەدان ، ئەیانکوشتن ، بەزیندویی ئەیانسوتانن ، ئەم دادگا پڕ لە ستەمکاری یانە لە سەدەی سیازدەیەمی زایینیدا دامەزران • بە درێژایی ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست بوبونە چەکی دەستی کلیسا کاثۆلیکەکانو ڕیژیمی فیودالی •• لەو سەدانەدا چەندان زاناو دانشمەندو ئەدیبو ڕۆشنبیرو نوسەرو پزیشکو هونەرمەندو پیاوی دەرکەوتوو ئازادیخوازو زۆر لێکراوو چەندان کۆمەڵ خەڵکی سادە ـ کە کلیسا رقی لێیان ئەبۆوە ـ بونە قوربانی ئانکیزیسیون • هەمو دادگاکان خەڵکیان بە بیانوی بێ باوەڕی ئەکوشت ، گوایە باوەڕیان بە کلیسا نیە ، ئەو دادگایانە دڕندانەترین شێوەی ئازاردانی خەڵکیان بەکار ئەهێنا کە تا ئێستا هێشتا ناوو ناوبانگی ماوە •

هەروەها ئانکیزیسیون وەکو ئالەتێک وابو بە دەست ستەمکارانو فەرمانڕەوایانی کلیساوە بۆ کۆ کردنەوەی دەرامەتی تایبەتی خۆیان • زوربەی ئەو کەسانەی کە ئەیانکوشتن دەستیشیان بەسەرماڵو سامانەکانیان دائەگرتنو تالانیان ئەکردن •

● **ئۆمانیسم** Humanisme

سیستەمێکی بیروباوەڕی‌یە کە لە روکاری تایبەتی یان خۆشەویستی‌و مرۆڤ دۆستی‌و پەیوەندی دۆستانەو بەختیاری رێز گرتنی تیا دەر ئەکەوێت •• لەباری سەرنجی مێژوییەوە سیستەمێکی فیکری بەو جۆرە لە سەدەکانی ١٤و١٦ ی زایینی‌دا وەکوراپەڕینێکی کۆمەلایەتی‌و ئەدەبی دەرکەوت کە لە کرداردا دژی ئایدیۆلۆجی فیودالی‌و توێژە مەزهەبی‌یەکان بون • ئەم سیستەمە لەو کاتەدا لەلایەن کۆمەڵێك رۆشنبیرەوە پەیڕەوی ئەکرا کە لە پێناوی لەناو بردنی سیستەمی فیودالی‌دا هەوڵی سەرکەوتنی راپەڕینی بۆرجوازی‌یانەیان ئەدا • رۆشنبیران‌و ماتەریالیستەکانی فەرەنسە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەرکەوتوترین نمونەی شێوازی فیکری ئۆمانیستی‌یان خستە روو • ئەوانە بون کە دروشمی « ئازادی ، یەکسانی ، برایەتی »یان بەرز کردبۆوە •• بەڵام ئەم دروشمە هاوکاتی گۆڕانی سەرمایەداری بو لەناو چوارچێوەی قازانجی بۆرجوازی‌دا خۆی گرت • تا ئەو کاتەی داوای ئازادی‌و خەڵك نەچەوساندنەوەیان کرد ، ئەوە بو فاشیزم‌و میلیتاریزم لەناویان بردن •

مەفهومی ئومانیسم لەلایەن بە خەیاڵ سوشیالیستەکانی وەکو : سان‌سیمون ، فوربیە ، ئوین ••• تەنیا ناوەڕۆکێکی کۆمەلایەتی تازەی هەبو ، بەڵام لە واقیع دا بریتی‌یە لە مرۆڤ دۆستی واقیعی • ئامانجی ئۆمانسیم سوشیالیستی‌و ئازادی تەواوی زەحمەتکێشانە •

● **ئایدیۆلۆجی :** Ideologie

ئایدیۆلۆجی بریتی‌یە لە سیستەمی تیوری‌و بیرکردنەوەی سیاسی ، ماف ، هونەری ، مەزهەبی ، فەلسەفی ••• تیوری لە زەمینەی رەووشتدا • ئایدیۆلۆجی بەشێکە لە سەرخانی فیگری کۆمەڵ‌و خاسیەتی چینایەتی‌یانەی

هەیە ، لەبەر ئەمە پەیوەندی‌یە ئابوریەکانی ژێرخانی کۆمەڵ نیشان ئەدات ٠

لە کۆمەڵگایەکی چینایەتیانەدا راپەڕینی چینایەتی جەنگی ئایدیۆلۆجی یە ٠٠ قازانجی چینە کۆنەپەرستەکان لە کاتی سەرەمەرگدا هەوڵ ئەدەن کە واقیعەت لەناو بچێو راستی بکرێ بەژێر پێوە ٠٠ لەبەر ئەوە ئایدیۆلۆجی ئەو چینە کۆنەپەرستانە راست نین‌و راستی دەرنابڕن‌و شتێکی زانستیانە نین ٠ بە پێچەوانەی قازانجی چینە پێشکەوتووە شۆرشگێرەکانەوە کە ئایدیۆلۆجی‌یان واقیع دەر ئەبڕێت ٠

لەم دوایەدا(١) فەیلەسوفەکانی بۆرجوازی کەوتونەتە پڕوپاگەندە کردن کە گوایە ئایدیۆلۆجی پێویست ناکات تێکەڵ بە زانست‌و واقیع بکرێ ٠٠ ئەوانە ئایدیۆلۆجی بە کارێکی دەرونی ئەزانن ، وەها داوا ئەکەن کە ئەبێت فەلسەفەو زانین لە هەر جۆرە ئایدیۆلۆجی‌یەك دوربن ٠٠ ئەمەش تەنیا ئەوە ئەگرێتەوە کە ئەیانەوێت زانست‌و فەلسەفە لە راپەڕینی چینایەتی‌و واقیعیەتی کۆمەڵ جیا بکرێتەوە ٠ مەبەستی سەرەکی ئەم داخوازی‌یەشیان تەنیا ئەوەیە ئایدیۆلۆجی شۆرشگێرانە کە تەنیا ئایدیۆلۆجی واقیعی‌و زانستیانەیە لە واقیع دور بخرێتەوە ٠

گەشە کردنی ئایدیۆلۆجی هەر چەند بەستراوە بە پەیوەندی‌یە ـ کانی ئابوری‌یەوە ، بەڵام لە هەمان کاتدا تارادەیەك سەربەخۆیی هەر هەیە ٠ جۆری ئەم سەربەخۆیی‌یە بە « تایبەت » ئەبینن کە ناتوانرێ ناوەرۆکی ئایدیۆلۆجی بە بێ هۆو راستەو خۆ تێکەڵ بە باری ئابوری بکرێ ٠٠ جگە لەوە گەشە کردنی هۆیەکانی ئابووری‌و ئایدیۆلۆجی هاو شانی یەك نین ٠ سەربەخۆیی ئایدیۆلۆجی بەهۆی کاریگەرێتی گەشەکردنی

(١) سەرەتای سەدەی بیستەم‌و کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم ئەگرێتەوە ٠

ئایدیۆلۆجیو ، پێشکەوتنی سیستەمی تیوریو بیرکردنەوەوە ــ کە ئەمانــە هیچ ماهیەتێــکی ئابوریيان تیا نیە ــ سەر ئەگرێت • هەروەهـا بە زۆری چەند ئایدیۆلۆجییەکی جیـا جیـا کـار ئەکـەنە سـەر گەشەکردنو سەربەخۆیی یەکتر •

## ● ئانتی سمیتیزم Anti - Semitism

لە زمانە ئەوروپایيەکانا بە مانای « دژی سامی »هاتووە ، بەڵام بـە شێوەی تایبەتی بە مانای « دژی جولەکە »لێک ئەدرێتەوە • لە ئەوروپای سەدەی بیستەمدا دوژمنایەتیکردنی جولەکە کە لە سەر شێوازێـکی ئاینیانە بوو گۆڕدرا بە دوژمنایەتیەکی رەگەزی ، ئەڵەمانیا بوو بە مەڵبەندی توندو تیژی ئەم دوژمنایەتیە ، کە دوژمنایەتی جولەکەکان بکـات بە شــێوەی رەگەزایەتی •• لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ پەیدابونــی چەندان تیوری دا لایەنگرانی ئەم بیروباوەڕە گەلێک هەوڵیـان دا پایــەی زانستییانە بۆ ئەم تیورییە دابنێن •

بەڵام گەورەترین هۆی پەیدابوونی ئەم تیورییە لە راستیدا گەشە کردنی باری ئابوری جولەکەکان بو کە لە کاروباری بازرگانیو پیشەیدا گەلێک باڵا دەستو پێشکەوتو بون • هۆیەکی تریش ئەو گێژاوە ئابوریو کۆمەڵایەتیەی ئەڵەمان بو کــە لە دوای تێــکشکانی یەکەمین شەڕی جیهانی رویدا تیایا کــە هیتلەرو هاوکارەکانی ئەمەیان بە هۆی بونــی رەگــەزی جولەکە ئەزانی •• لە ئەڵەمانیای نازیدا هیتلەر چەند یاسایەکی دانا کەبوو بە هۆی دور خستنەوەی ئەنیشتاینو فرۆیدو چەندان زانای گەورەی تــر لە وڵاتدا •

بەرهەمو شوێنەواری مۆسیقا زانەکانــی وەکو مندلســنو ئافنباخ بــە

ئەواوی قەدەغە کران • جولەکەکان لە هەموو مافێکی شارستانیو ئیشکردنی بازرگانیو پیشەیی بێبەش کرانو دەستە بە دەستە ئەیانناردن بۆ ناو هووردوگا زۆرەملیەکانو زیاتر لە پێنج ملیۆن کەسیان لێ لەناو چو •

لە سەدەی نۆزدەیەمو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئەورووپای رۆژهەلات بوو بە مەلبەندی بلاو بونەوەی پروپاگەندەی دژی جولەکە •• وە هەر لەو کاتو سەردەمو شوێنەدا بو بزوتنەوەی زایۆنیزم دەستی پێکرد لەو ولاتانەدا ، لەگەل ئەوەدا لە سالی ١٩٥٤ بە دواوە یاسای بنچینەیی رێزی هەمو نژادو رەگەزو نەتەوەو ئاینەکان وەکو یەك ئەگرێ کەچی لە هەمان کاتا ــ تارادەیەك ــ شوێنەواری دژی جولەکە بەدی ئەکرێو رۆژنامەو رادیۆی هەندێک لە دەولەتانی ئەوروپا(١) جاروبار پەلاماریان ئەبەنە سەر ••

● **بایکوت** Boycottage

ئەتوانین ئەم زاراوەیە بە مانای « بێبەشکردن »لێك بدەینەوە ، مەبەست لەم بێبەشکردنەش شێوازێکی بەربەرەکانێی سیاسیانە یان ئابوری یانەیە کە بریتی یە لە دابرینی پەیوەندی لەگەل کەسێکدا ، یان رێکخراوێك ، یان دەولەتێک •• بۆ نمونە : ئەگەر وتمان « خەلك کولوپەلی دەرەوەیان بایکوت کردوە » مانای ئەوەیە کە خەلك کەلوپەلی دەرەوە ناکرنو لێی دور ئەکەونەوە • یان نمونەیەکی تر بلێین : با دەولەتی ئەفەریقای خوارو بایکوت بکەین •• واتە با پەیوەندی لەگەل دەولەتی ئەفەریقای خوارووا ببرین •• یان نمونەیەکی تر : لە گەرەکێکدا خەلك هەست بەوە ئەکەن کابرایەك خرابە ، ئەلێن با ئەو

---

(١) بەتایبەتی رومانیاو پۆلەندە ••

کابرایە بایکوت بکەین ، واتە هیچ جۆرە قســـەو رازو نیـازو مامـەڵەو پەیوەندییەکی لە گەڵا نەکرێ •

ئەوەش بڵێین کە بایکوت کردن دوو رواڵەتی هەیە : پێشکەوتوانەو کۆنەپەرستانە •• وە ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم بایکوت کردنە لەگەڵ کێدا ئەکرێ وە بۆ چ مەبەستێك ئەکرێ ؟ • تاکو بزانین ئایا رووالەتـە پێشکەوتوانەکەیە یان کۆنەپەرستانەکە •

ئەو نمونانەی هێنانمانەوە بۆ نمونەی بایکوتی پێشکەوتوانەیە ، بەڵام دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانیش وەیان کاربەدەستانی دەزگـاو دامـەزراوە سەرمایەدارییەکان ئەمکارە لە دژی دەوڵەتە سوشیالیستییەکانو کۆمەلانی خەڵـکی زەحمەتکێش بەکار ئەهێنن •

ئەم وشەیە لە ئەسڵدا ناوی ئەفسەرێـك بووە لە کاتی ناکۆکی نێوان بەریتانیاو ئێرلەندە کە لەسەر سەربەخۆیی ئێرلەندە ناکۆك بون ئەو ئەفسەرە ناوی بایکوت بو تەگبیری بۆ ئێرلەندییەکان کرد کە هیچ جۆرە کەلوپەلێکی بەریتانیا نەکرنو پەیوەندی مامەڵەو مامەڵەکاری لەگەڵدا بـبـرن • ئیتـر بەناوی ئەو ئەفسەرەوە ئەمکارە ناونرا بایکوت ••

## ● بلانکیسم Blankisme

ناوی جۆرە راپەڕینێـکی پێشکەوتووانەیە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە فەرەنسە رویدا ئەم زاراوەیە پەیوەندی بە ناوو چالاکی « ئوگوسـت بلانگی » شۆرشگێری بەناوبانگەوەیە • ناوبراو لەو باوەڕەدا بـووە کـە ئەتوانێـت بە راپەڕینی کۆمەڵـە شـۆرشـگێڕێـکی بچوك دەســـەڵاتی سەرمایەداری لەناو ببات ، بێ ئەوەی کۆمەلانی خەڵك پشتگیری لێ بکەن ، وەهەر بە هۆی ئەو کۆمەڵە بچوکەوە ئەتوانێت بگاتە سوشیالیزم •

ئیستا مەفهومی گشتی بلانکیسم بریتی‌یە لە تاکتیك‌و پیلانی کۆمەڵێکی بچوك کە پشت بە کۆمەلانی خەڵك نەبەستێت ، بلانکیستەکان باوەڕیان بە جەماوەرو یەکگرتنی ڕێکخراوەکان نیە .. ئەمانە بەلایانەوە کەم بایەخن .

ئەمە مەفهومی گشتی ئەمڕۆی بلانکیسمە .. پێویستە ئەوەش رون بکەینەوە کە « لوئی ئوگوست بلانکی » [ ١٨٠٥ - ١٨٨١ ] یەکێك بووە لە شۆرشگێرە دەرکەوتووەکانی فەرەنسە ، کە چالاکی‌و خۆ فیداکاری ئەو لە مێژووی راپەرینی کرێکارانی فەرەنسەو جیهاندا ئاشکرایە .. ئەو زیاتر لە شەست ساڵ تەمەنی خۆی سەرۆکایەتی ئەمجۆرە رێکخراوو کۆمەڵە نهێنی‌یانەی کردوە . دوجار خۆی بۆ کودتا ئامادە کردوە ، دوجار حوکمی مردنی دراوە ، هەردو جارەکە حوکمەکەیان بۆ کردوە بە زیندانی هەمیشەیی ، زیاتر لە چل ساڵ حەپس بووە ، لە ساڵی ١٨٧١ کاتی یەکەمین راپەرینی کرێکارانی فەرەنسە-کومونی پاریس - هەرچەند دوربو لە راپەرینەکەوە ، بەڵام کرا بە ئەندامی کومون‌و رێزی لێ گیرا . دوساڵ بەر لەوەی بمرێت بێ ئەوەی خۆی لە ئارادا بێت بۆ ئەندامی ئەنجومەن هەڵبژێردرا . بەو هۆیەوە لە زیندان بەرەڵلا کرا . بەکارهێنانی شێوەی شۆرشگێری‌یەکەی لە پێناوی گۆڕینی کۆمەڵدا رەت ئەکردەوە ، ئەمڕۆش بەو چەپڕەوانەی کە بایەخ بە پێگەیشتنی رادەی کۆمەڵ بۆ شۆرش،بوونی هەل‌و مەرجی لەبارو پێویستی راپەرین‌و داخوازی سیاسی‌و تاکتیك‌و ستراتیج نادەن ، ئەتوانین ناوی تازە بلانکسیم « نێو بلانکسیم »یان لێ بنێین .

● **بۆرجوازی** Bourgeoisie

لە فرماسیونی کۆمەلایەتی - ئابوری سەرمایەداری دا دو چینی

بنچینەیی : پرۆلیتاریاو بۆرجوازی هەیە •• بۆرجوازی بریتی‌یە لە چینی سەرمایەداران ، واتە ئەو کەسانەی کە هۆیە سەرەکی‌و بنچینەییەکانی بەرهەم هێنانیان وەکو : کارخانەو فابریقەو بانق‌و هۆیەکانی گواستنەوەو دابەشکردن‌و •• بە دەستەوەیەو سود لە کاری خەڵك‌و رەنجی کرێکاران وەر ئەگرن •

لەروی باری زمانەوانی‌یەوە ئەم زاراوەیە لە وشەی « بۆرگ » کە بەمانا « شار » ئەگرێتەوە وەرگیراوە • کە بە دانیشتوانی شارەکانیان ئەووت « بورجوا » •

لەبەر باری سەرنجی مێژوویشەوە بۆرجوازی لە مناڵدانی کۆمەڵگای فیودالی‌دا ئەخەملێ‌و لە قۆناغی لەناو چونی کەلوپەلی وردەواڵەیدا پەیدا ئەبێت‌و گەشە ئەکات • هەروەها لە قۆناغی پەرەسەندنی سەرەتایی سەرمایەداو لەناوبردنی خاوەن بەرهەم هێنەرە بچوکەکان‌و کردنیان بە کرێکاری رۆژانە وەکو چینێك دەر ئەکەوێت •

دوای ئەوە لە ماوەی چەندان سەدەی پڕ لە بەربەرەکانێ دا توانیوێتی دەسەڵاتی سیاسی‌و ئابوری خۆی سەقامگیر بکات • شۆرشی بۆرجوازی‌یانە ئەو شۆرشەیە کە دەسەڵاتی فیودالیزم تێك ئەشکێنێت ، بۆرجوازی رابەرایەتی ئەو شۆرشە ئەکات‌و لەئەنجامدا دەسەڵاتی خۆی لەناو کۆمەڵدا ئەچەسپێنێ •

ئەمجۆرە شۆرشانە لە سەدەکانی حەفدەیەمەوە تا نۆزدەیەمی زاینی رویداوە • لەو رۆژگارانەدا بۆرجوازی چینێکی پێشکەوتوانەی سەردەمی خۆی بووە ، چونکە داوای پێشکەوتنی کۆمەڵ‌و لەناوبردنی فیودالیزمی ئەکرد • قازانجی ئەم چینە بەسترابو بە هێزە بەرهەم هێنەرەکانەوە،بەلام

دوای پێگەیشتن‌و گەشە کردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری ، بۆرجوازی بوو بە چینێکی کۆنەپەرستانە •

لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا ـ کە دوا قۆناغی سەرمایەداری‌یە ـ ماهیەتی کۆنەپەرستی‌و ئەنگلی بۆرجوازی زیاتر لە هەر کاتێکی تر دەر ئەکەوێت • قازانجی بۆرجوازی بە هیچ‌جۆر لەگەڵ قازانجی کرێکاران‌و زەحمەتکێشاندا یەك ناگرنەوە • ناکۆکی نێوان بۆرجوازی‌و پرولیتاریا ناکۆکی یەکی سەرومالی‌یە •• ئەم ناکۆکی‌یە بنچینەی راپەڕینی چینایەتی‌یە کە لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی بەرپا بونی شۆرشی سوشیالیستی‌و لەناوبردنی سەرمایەداری‌و سەقامگیربونی ملکداریێتی هەرەوەزی‌و هۆیەکانی بەرهەم هێنان ئەبێتە ملکی تێکرای گەل •

بۆرجوازی ئەبنە چەند بەشێکەوە ؛ هەر بەشە سەرمایەی خۆی لەبوارێکدا ئەخاتە کار وەکو ؛ بۆرجوازی سنعەتکار ، بۆرجوازی بازرگان بۆرجوازی خاوەن بانق ، بۆرجوازی لادێ کەپێی ئەڵێن «کۆلاك» • سەرچاوەی قازانجی هەموو ئەمانە کارپێکردنی زیادی کرێکارانە •

● **بۆرجوازی کۆمپرادۆر :** B - Comprador

تۆێژێکی دەوڵەمەندی دەرکەوتوون لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا ، کە پەیوەندی‌یەکی توندو تۆڵیان لەگەڵ دەزگا ئینحیساری‌یەکانی بێگانەدا هەیەو سەرمایە کانیان لەگەڵ سەرمایەی ئیمپریالیستی‌دا تێکەڵ کردووە • قازانجیان داکۆکی لەسەر پاراستن‌و مانەوەی قازانجی بێگانە ئەکات •

زاراوەی « کۆمپرادۆر » لە زمانی ئەسپانیەوە وەرگیراوە ، کە بەمانا کڕیار ئەگرێتەوە زوربەیان بازرگانی گەورەو خاوەن کارگەی مونتاجن ،

که بەشێکە لە دەزگە سنعەتی‌یە ئیمپریالیستیەکان • خاوەن بانقەکان بە هۆی تێکەڵی سەرمایەکەیانەوە لەگەڵیانا پەیوەندی‌یەکی تەواویان هەیە •

**بۆرجوازی کومپرادۆر** Comprador ئامێری دەستی سیاسەتی **ئیمپریالیزمە** ، دوژمنی سەرسەختی سەربەخۆیی نیشتمانی‌یە ، دوژمنی **هەمو** جۆرە راپەرینێکی ئازادیخوازانەیە ، هۆی تالآنکردنو دەست بەسەرا گرتنی ئابوری‌و دەسەڵاتی سیاسی ئیمپریالیستەکانەو خۆیشی سود لەو کارانە وەر ئەگرێ‌و خاوەنی کۆنەپەرستانە ترین بیرو باوەڕو دژی نیشتمانی ترین ڕێبازی سیاسەتە •

راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلان ، نەك تەنیا دژی ئیمپریالیستەکانی دەرەوەیە ، بەڵکو بە توندی دژی ئەم نۆکەرانەی ئیمپریالیزم ئەوەستێ‌و هەوڵی لەناو بردنیان ئەدات •

● **بۆرۆکراسی** Bureaucracy

بە توێژی ئیداری هەر دەزگاو رێکخراوێك ئەڵێن کە بەڕێوە بەرێتی‌یەکی فراوانی هەبێت ، بە تایبەتی لە دەزگاو دامەزراوە دەوڵەتیەکانا ، هەندێك جاریش وەکو چینێك سەیریان ئەکرێت •

لە بواری شی‌کردنەوەی چینایەتیانەدا بۆرۆکراسی بە چینێك دانانرێت •• بەڵکو بە ئامێری دەستی چینە فەرمانڕەواکان دائەنرێ •• لەبەر ئەمە لەبواری کۆمەڵ شوناسی‌دا دیسان لە دوای لەناوچونی سەرمایەداری چاوەڕوانی هاتنەدی هیچ جۆرە چینێکی تر ناکرێت • بەڵام هەندێك لە کۆمەڵ شوناسانو بیرکەرەوە سیاسی‌یەکان دەم لە هاتنە کایەی چینێکی ترەوە ئەدەن کە لەگەڵ نەهێشتنی مڵکداریتی تایبەتی‌و خاوەنداریتی هۆیەکانی بەرهەم هێناندا مڵکداریتی هەرەوەزی

دێتە گایەوە • لە جیاتی کاپیتالیزمی دەوڵەتی ، کاپیتالیزمی تایبەتــی دێتــە پێشەوە •• ئەمانە خۆیان ئەبنە چینێــکی فەرمانڕەوا بە سەر خەڵــکدا •

● **بەربەریسم** Barbarism

بەو مرۆڤانە ئەوترێ کە لە روی هۆش‌و بیرکردنەوەوە دواکەوتو بن • کاتی خۆی‌و ــ تەنانەت ئێستاش(١) ــ لە هەندێــک کاتا بەو خێڵ‌و خەڵــکانەی ناوچەکانی ژورووی ئەفەریقایان ئەوت •• بەڵام ئەمــڕۆ بــۆ مرۆڤ‌و خەڵــکی دواکەوتو دەست وەشێن ئەڵێن •

● **پارلمان** : Parlman

پارلمان بە کۆمەڵی نوێنەران ئەڵێــن کــە ئەرکــی یاســادانانیان لــە ئەستۆدایە • لە ئێــران‌و تورکیــە پێی ئەڵێــن « مەجلیســ » لە وڵاتــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هەندێــک وڵاتانــی ئەمەریــکای لاتیــن « کۆنگریس »ی پێ ئەڵێن •

لە هەندێــک وڵاتدا پارلمان لە دو کۆمەڵ پێک دێت وەکو « شورا ، سەنا »• ئەنجومەنی ئەعیان ــ پیاو گەوران یان لوردەکان ــ دەوڵەمەندەکان • بە پێی یاسا ئەندامانی پارلمان لە لایەن خەڵکەوە هەڵ ئەبژێر درێن ، لــە هەندێــک شوێنیش دا بە میراتی ئەبنە ئەندامــی پارلمان • لــە وڵاتــە سەرمایەدارییەکانا لە رووی ماهیەتەوە دو جۆر پارلمان هەیە :

لەو وڵاتانەی کۆماری پارلمانیــن وەکــو : [ ئیتالیــا ، تورکیــە ، هیندستان •••• ] ، یان لەو وڵاتانەی کە پاشایەتی مەرجدارن ( مەشروطەی سەڵتەنەتی ) وەکو [ بەریتانیا ، سوید ، دانیمارک ••••]، پارلمان چاودێری

---

(١) مەبەست نوسینی سەردەمی کتیبەکەیە ••

هەمو کاروبارێـکی دەوڵەت ئەکاتو بە گەورەترینو باڵا ترین سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت ئەژمێردرێت • لەو وڵاتانەی تر کە سەرکۆمار دەسەڵاتی فراوانی هەیە وەکو [ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ، فەرەنسە ، چەنـد وڵاتێـکی ئەمەرێـکای لاتین ••••] ، پارلمان تەنیا خەریکی ئەرکی یاسا دانان ئەبێت ، کۆڕی وەزیران بەرپەرچی پارلمان ناداتەوە •

بەڵام وڵاتە دیکتاتۆری‌یەکان ئەگەرچی بە رواڵـەت ئەنجومەنـی پارلمانیشیان هەبێت ، کەچـی پـارلمان لەو جـۆرە دەوڵەتانـەدا وەکـو دەزگایەکی دەستە پاچە هیـچ رۆڵێـکی نیە و سـەرکردەکـانی ریژیـم هەرچەند بە رواڵەت هەڵبژاردنی درۆ دەست پێ ئەکەن بەڵام لە واقیعدا هەمو کارێـکیان ئارەزووکاری یە •

● **پاسیفیسم** Pacifisme

ئەم زاراوەیە لە وشەی لاتینی وەرگیراوە بەمانا صـولحو ئاشـتی ئەگەیەنت ، دیسان بەلایەنگرانی صولحو ئاشتی ئـەوترێت • پاسیفیسم رێبازێـکی شێوە لیبراڵە ، ئەوانەی باوەڕیان بەم رێبازە هەیە دژی هەمـو جۆرە جەنگێکن(١) وە لەو باوەڕەدان کە تەنیا بە قسە کردنو راوێژکاری ئەتوانن ئاشتی بچەسپێنن • لە سەردەمی ئێستای ئێمـەدا کـە سـەردەمی کێشەی کۆمەڵانی خەڵكو ئیمپریالیزمە پاسیفیستەکان هەوڵی ئەوە ئەدەن هەمو کێشەیەك بە ئاشتی ببڕێتەوەو تای مەسەلەکە بە لای قازانجی بەرەی ئیمپریالیزمدا بشکێتەوە • ئەمانە هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدەن شەڕ لەروی ئیمپریالیزمدا نەکرێت •

---

(١) وە نەبێ لەروی زانستی‌یەوە جۆرەکانی جەنگ بەراورد بکەن •
**وەرگیر**

لایەنگری ئاشتی پێویستە ئازاو جەنگاوەر بێت ، ریشەی ریژیمی سەرمایەداریو سروشتی ئیمپریالیزم هەڵکەنێ •• شۆرشگێر هەمیشە پشتگیری لە شەڕی عادیلانەو شۆرشگێڕانەی دژی ئیمپریالیزم ئەکات •• پاسیفیسم بەیەك چاو سەیری دو مەسەلەی دژ بە یەك وەکو « شەڕی عادیلانەو شەڕی ناعادیلانە » ئەکات •

● **پرۆلیتاریا** Proletariat

بە چینی کرێکار ئەوترێ ، واتە بەو کەسانە ئەوترێ کە هیچ جۆرە هۆیەکی بەرهەم هێنانیان نیە ، ناچارن هێزی کاری خۆیان بە خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنان ــ واتە سەرمایەدارەکان ــ بفرۆشن ••

کرێکاری سنعەتی دەقانەدەق پرۆلیتاریا ئەگرێتەوە • بەم پێیە مەفهومی تایبەتی ئەم وشەیە پەیوەندی بە کۆمەڵگای سەرمایەداری یەوە هەیە ، ئەگەرچی لە زۆر بواردا بە چینی کرێکار بە گشتی ئەوترێت پرۆلیتار •

پرۆلیتاریا هۆشیار ترین چینی شۆرشگێرە لە کۆمەڵگان سەرمایەداری‌دا ، چونکە پرۆلیتاریا لەگەڵ پێشکەوتوترین یان نزمترین شێوەی بەرهەم هێناندا واتە چەرخی سنعەتی‌و بەرهەم هێنانی سنعەتی گەورە پەیوەندیدارەو لەگەل ئەواندا گەشە ئەکات •

پرۆلیتاریا لە بارەی رێکخستن‌و کاری هۆشیارانەوە لە چینەکانی‌تر لەپێشترو هۆشیار ترە •• بەربەرەکانێی پرۆلیتاریا لە دژی بۆرجوازی ناوەرۆکی یاسای کۆمەڵگای سەرمایەداری‌یە •

پرۆلیتاریا لە کاتی راپەڕیندا بۆ خۆ رزگار کردن ئەتوانێ‌و پێویستە هەمو کۆمەڵانی زەحمەتکێش‌و ــ بە تایبەتی جوتیاران ــ بۆ لای خۆی

رابکێشێو رابەری ئەو راپەڕینەی بکات لە دژی سەرمایە داران • هەروەها پرۆلیتار –چینی کرێکار– ئەتوانێ پەیامی مێژوویی لە ناوبردنی بۆرجوازیو بونیاتنانی کۆمەڵگایەکی تازەی سوشیالیستی بەجێ بگەیەنێت • لەباری سەرنجی مێژووییەوە چینی پرۆلیتاری سنعەتی لەگەڵ پەیدا بونی شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری ، واتە لە قۆناغی لەناوچونی فیودالیزمدا پەیدا ئەبێت •• ماڵوێرانیو سەرگەردانی جوتیارەکان کە زەویو زارەکانیان لە دەست ئەدەن ، یەکەمین سەرچاوەی هاتنە کایەی پرۆلیتاریایە ، دوای ئەوەش سەرگەردانیو تێکشکانی وردە بۆرجوازی شارو لادێ لەگەل گەشە کردنی سەرمایەداریدا ئەبێتە هۆی بەهێز بوونی ریزەکانی پرۆلیتاریا •

لە دوای شۆرشی سوشیالیستیو لەناوبردنی چەوساندنەوە پرۆلیتاریا ئەبێتە چینێکی تازە ، چینێکی کرێکار کە سیستەمی سەرمایەداری لەناو بردووەو هۆیەکانی بەرهەم هێنان تێکڕا بونەتە مڵکی سیستەمی سوشیالیستیو چارەنوسی خۆی ئەکەوێتە دەست خۆی •

● **پروپاگەندە – ئاژیتاسیۆن** Propagande - Agitation

**پروپاگەندە ؟**

بلاو کردنەوەی بیری سیاسیانەو فەلسەفیو مەفهومی ئەو شتەی کە پێویستە رابگەیەندرێت ، بە زۆری لەناو کۆمەڵدا بلاو ئەکرێتەوە ، بەلام قوڵترو هەمە لایەنانە ترەوشێوەی پروپاگەندە زۆر تر شێوەی شیکردنەوەی ئاقلانەیە • هەمو رێکخراوو دەستەو کۆمەڵە سیاسیەکان سود لە پروپاگەندەو ئاژیتاسیۆن وەر ئەگرنو بە چەندان جۆر خزمەتی مەبەستی خۆیانی پێ ئەکەن • ئەویش هەندێکیان بە قازانجی گەلو زەحمەتکێشانەو هەندێکیشیان بە قازانجی بەرەی دژ بە گەلە •

**ئاژیتاسیون : (١)**

واتە هۆی کارتێـکردنە خەڵك لەرێـگای گفتو گۆو ، قسەکردن ، کۆبونەوەو ئاهەنگ ، رۆژنامە ، کتێـبو نوسـراو ، رادیـۆ ، سـینەما ، تەلەفزیۆنو .... زۆر جا رکە بۆ هۆشیاری خەڵكو شیکردنەوەی تیوری لەناو خەڵـکدا بەکار بێت ئەوە بە چالاکی ناو ئەبرێت . ئاژیتاسیۆن بـە تایبەت لەناو جەماوەردا وەکـو کارێـکی سیاسـیو راگـەیانـدن دەوری کاریگەرێتی خۆی ئەنوێنێ . ئاشکرایە ئاژیتاسیۆن پەیوەندی‌یەکی بەتینـی بە ئەرکە سیاسی‌یەکانی رێـکخراوەکانەوە هەیە .

● **تیرۆریسم** Terrorism

بە مانا کێویو درندەیەتی ئەگرێتەوە ، تیرۆریست بە پیاو کوژو دەست وەشێن ئەووترێ ، واتە ئەو جۆرە کەسانەن کە لە پیاو کوشتنو کـرداری خراپە هیچ کۆیەك ناکەنەوە .. هەرەشە لە خەڵـك ئەکـەنو ئەمـو ئەو ئەترسێنن ، ترس ئەنێنەدڵی خەڵـکەوە ، خەڵك ئەرفێننو ئەیشارنەوە .یان لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجیانا هەمو کارێـکی ناڕەوا ئەکەن .. ئەمە ئێستا وەکو بیروباوەڕی لێ هاتووە لە جـۆری بیـر کردنـەوەی فاشیسـتیو مایکافیلی‌یە .

● **تیـوری** Theorie

بریتی‌یە لە بڵاوبونەوەی تاقیکردنەوەو پراتیکی کۆمەلایەتی ، تیوری کۆمەڵە بیرکردنەوەیەکی رێ نیشـاندەرانەیە لە زەمینـەی زانستیەکانـی

---

(١) هەرچەند بەپێی ریزی پیتەکان جیگای ئاژیتاسیون لێرەدا نیـــە بەلام لەبەر ئەوەی پەیوەندی مەفهومیان لەگەل پروپاگەندەدا هەیـە لـێرە دانرا ـ وەرگـێر ـ

ئادەمیزاددا ، بریتی‌یە لە ئاراستە کردن‌و رونکردنەوەی زانستی یاساکانی گەشەکردن لە بواری سروشت‌و کۆمەڵدا • تیوری کە لەسەر بنچینەی پراتیك‌و کارکردن پەیدا ئەبێت رۆڵێکی گەورە لە ژیانی کۆمەڵداو لە بواری زانستی‌یەکانی تری ئادەمیزاددا دیاری ئەکات‌و رێگای دور بۆ چالاکی ئادەمیزاد رون ئەکاتەوەو پراتیك بەرەو پێش ئەبات •

تیوری شۆرشگێڕانە ئەوەمان فێر ئەکات کە بەڵگەی سەرکەوتنی ئەرکەکانی کۆمەڵ بریتی‌یە لە یەکێتی نێوان تیوری‌و پراتیك نێوان بیر کردنەوەو کار کردن ، هەر تیوری‌یەك ئەگەر لەگەڵ کاری شۆرشگێڕانەدا لەگەڵ پراتیکی گۆڕین بەخش دا یەکسان نەبێت ئەوا ئەهمیەتی ناوەڕۆکی خۆی ئەدۆڕێنی •• هەروەها پراتیك‌و کارکردنیش ئەگەر بە چرای رێ نیشاندەرانەی تیوری شۆرشگێڕانە رون نەکرێتەوە ئەوا کوێرو بێ بەرهەم ئەمێنێتەوە ••

رێکخراوە شۆرشگێڕی‌یەکان پایەی چالاکی خۆیان لەسەر یەکێتی نێوان تیوری‌و کارکردن ـ واتە تیوری‌و پراتیك ـ دائەمەزرێنن • تیوری شۆرشگێڕانە کۆمەڵە بیرکردنەوەیەکی رێ نیشاندەرانەی چالاکی‌و کارکردنی رێکخراوە کرێکاری‌یەکانە • رۆڵی کاریگەرانەی تیوری شۆرشگێڕانە لەوەدا بەدیار ئەکەوێت کە زەمینەی زانستی بۆ رێکخراوە کرێکاری‌یەکان خۆش بکات ، بۆ ئەوەی لە هەر بارو دۆخێکدا رێگای خۆیان دەست نیشان بکەن ، روداوەکانی بەردەم خۆی بە واقیع ببینێ • چالاکی خۆی لەسەر پایەی زانستی دابمەزرێنێ ، شوێن کەوتنی دوگماتیکانەو دوبارە کردنەوەی کاری کوێر کوێرانە « واتە کوێرانە شوێن کەوتن »بە هیچ جۆر لەگەڵ رێبازی شۆرشگێڕانەدا ناگونجێت‌و هیچ ئەنجامێکی بە سودی نابێت •

### ● تەکنۆکراسی Technocracy

حکومەتە خاوەن تەکنیکەکان ، جۆرە حکومەتێک کە لەگەڵ سەردەمی پێشکەوتنی هونەریو زانستیدا بڕوات • لەو سەردەمەدا پێویستە هەمو سەرچاوە ئابوری یەکانو تەواوی کاروباری کۆمەڵ لەلایەن کارزانو زانایانەوە بەڕێوە ببرێن • تەکنۆکراتەکان کۆمەڵێك بون کە لە دوای یەکەمین شەڕی جیهانی دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لە رۆڵی کاریگەرانەی تەکنیك لە کۆمەڵدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا •

ئەمانە لەو باوەڕەدا بون کە پێشکەوتنی باری تەکنیك ، بە تایبەتی لە ئەمەریکای زورو ئەو سیستەمە ئابوری یەی کە لە ئارادابو لەسەر بنچینەی مەکانیزەی نرخو بەها دامەزرابو لەناوی بردووە ، لەبەر ئەوە کۆمەڵ لە سیستەمی نرخو بەهادا زۆرتر دوچاری قەرزو قۆڵە ئەبێت • لە ئەنجامدا توانای کڕینو فرۆشتن لەئاستی پێشکەوتنی باری تەکنیك دوا ئەکەوێت • ئەم دوا کەوتنە دۆخێکی نالەبار بە سەر باری نرخو بەهاو سەقامگیر بونی کۆمەڵدا دێنێت •

تەکنۆکراتەکان پێشنیاریان ئەکرد کە ئینیرژی بەرهەم هێنان سەنگی محەك بێتو لەگەڵ یاساکانی فیزیك دا بگونجێ ، لەو کاتەدا دەوڵەت ئەکەوێتە دەست کارزانە تەکنیکی یەکانەوە •

### ● توتالیتریزم Totaliterisme

**بەو ریژیمانە ئەوترێن کە ئەم خاسیەتانەیان تیا بێت :** دەوڵەت چاودێری هەموو کاروبارێکی ئابوریو کۆمەڵایەتی بکات ، دەسەڵاتی سیاسی بەدەست کۆمەڵێکەوە بێتو هەمو شێوەکانی دیموکراتی رەت بکاتەوە ، [ تەنانەت لە ناو کۆمەڵەکە خۆیشیدا ] •• تیرۆرو

سەرکوتکردنی هەرکەسێك کە سەرپێچی لە فەرمانەکانی سەرۆکی دەوڵەت یان کۆمەڵ بکات•هەوڵدان کە هەموکەس باوەڕ بە دەسەڵاتی سەرکردایەتی دەوڵەت بهێنێ • لەناوبردنی سەربەخۆیی تاکەکەسی ، چاودێری کردنی هەمو جۆرە چالاکی‌یەکی ئەدەبی‌و هونەری ، کۆ کردنەوەی هەمو هێزی خەڵك لە پێناوی خزمەتکردنی دەوڵەت‌و دەسەڵاتدا ، رێگا نەدان بە هیچ کۆڕو کۆمەڵێك کە بیانەوێ بیرو باوەڕو ئایدیۆلۆجی خۆیان دەر ببڕن •

دەوڵەتە توتالیتریزمەکان زۆر جار راپەڕینی دژی دیموکراتی ئەخولقێنن ، کە لە سەرەتاوە وەکو رێکخراوێك لەناو سیستەمێکی دیموکراتیدا کۆ ئەبنەوە • دوای دەسەڵات وەرگرتن دیموکراتی لەناو ئەبەن •

دەرکەوتوترین نمونەی ئەمجۆرە راپەڕینە جزبی ناسیۆنال سوشیالیستی ئەڵەمان بو کە هیتلەر رابەری ئەکرد ، کە دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست لە رێگای دیموکراتی لایداو دیموکراتی لە وڵاتدا لەناو برد •

ئیتالیای فاشیست‌و ئەڵەمانی نازی باشترین نمونەی دەوڵەتی توتالیتریزمن • زۆر جار هەندێك لەسیستەمە پێشکەوتووەکانیش بەم ناوەوە ناو ئەبرێن • بەڵام جیاوازی‌یەکی زۆر لە نێوان ئەم دو سیستەمەدا هەیە •

لە سەردەمی ستالین‌دا لە وڵاتی سوڤیەت کرداری تیرۆریستی‌و، حوکمی تاکەکەسی توندو تیژ بو ، بەڵام نازیزم‌و فاشیزم لەروی بونیاتنانی فیکری‌و ئایدیۆلۆجی‌یەوە دژی دیموکراتین •

**تابوری پێنجـەم :**

بەمانا خایەنە شاریاوەکانە ، کە خزمەتی بەرەی دوژمن ئەکـەن ..
لەروی فیکری و ئایدیۆلۆجی‌یەوە دژی دیموکراتین .
لە پشتی گەلەوە کرداری خراپەکارانە ئەکەن ،ئەم زاراوەیە یەکەمجـار
لە سەردەمی شەڕە ناوخۆیەکانی ئەسپانیادا لە ساڵەکانـی ٣٦ – ١٩٣٩
بەکار هێنراوە ، لەو کاتەدا کۆنە پەرستانی ناوخۆ بە سـەرکردایەتـی
جەنڕاڵ « فرانکو »(١)چون بە کۆمەکی فاشیستەکانی ئەڵەمانیاو ئیتالیاوە لە
دژی خەڵـکی ئەسپانیاو کۆماری تازە ئەجەنگان .

جەنڕاڵ مولا(٢) کە یەکێك بو لە سەرکردەکانی سـوپای فرانکـۆ
سەرکردەیی چوار لەشکری لە ئەستۆدا بو ، روی کردە « مەدرید » بۆ
ئەوەی کۆماریخوازەکان تێـك بشکێنێ ، مولا .. لەو کاتەدا وتی : مـن
تابورێـکی ترم لەناو خەڵـکی مەدریدا هەیـە کـە تابـوری پێنجـەمـی
لەشکرەکەمانە ، مەبەستی لەو خایەنانەی ناو خەڵـکی مەدرید بو کە بـە
دزی‌یەوە خزمەتی دوژمنیان ئەکردو دژی زەحمەتکێشە شۆرشگێڕەکان
خراپەکاری‌یان ئەکرد .. لەو کاتەوە زاراوەی « تابوری پێنجەم »بۆ ئـەو
خایەنانە دانراوە کە بە دزی‌یەوە لەناو خەڵـکا یـان ڕێـکخراوەکانـــدا
خزمەتی دوژمن و بێگانە ئەکەن .

● **تیموکراسـی** Timocracy

ئەفلاتون ئەم زاراوەیەی لە کتێبی کۆماری خۆیدا لە بارەی دەوڵەتەوە
ناو بردوەو بە کاری هێناوە ، واتە ئەو دەوڵەتانەیە کە سەر کردەکانیـان

---

(١) Franko.
(٢) Mola.

تەنیا لە پێناوی رێزو شانازیدا کار ئەکەن ، نەك لەسەر بنچینەی دادپەروەری‌و یاساو لەپێناوی شتی تردا •

## ● جیوپلیتیك Geopolitique

ئەم زاراوەیە لە دوو وشە پێك هاتووە ، « جیو » کە بە مانا زەوی وە « پلیتیك » بە مانا سیاسەت ئەگرێتەوە • ئەمە بریتی‌یە لە تیوری‌یەکی کۆنەپەرستانە کە هەوڵ ئەدات سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە ئیمپریالیستەکان بەهۆی عونسوری جوگرافیایەوە رون بکاتەوە •

ئامانجی سەرەکی ئەم رێبازە داگیر کردنی خاکی بێگانەو کۆیلەو ژێر دەستە کردنی خەڵکە ، بۆ نمونە هیتلەری‌یە فاشیستیەکان ئەیانویست ئەوە بسەلمێنن کە ئەڵمان پێویستی بە ژیانەو جەنگ لە پێناوی داگیر کردنی خاکی وڵاتانی دراوسێ‌و ژێر دەستە کردنی خەڵکدا کارێکی رەوای ئەڵمانیایە •• ئێستاش دەست درێژکارە ئیسرائیلیەکان بە پشتیوانی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا خاکی عەرەبیان داگیر کردووەو لەم رووەوە ئەم تیوری‌یە بەکار دێنن •• هەروەها رێبازو تیوری « نیاخاك » پان ئێرانیستەکان(١) لەم سەرچاوەیەوە ئاو ئەخۆنەوە •

## ● جەنگ War

جەنگ واتە راپەڕینی چەکدارانە لە نێوان وڵاتەکاندا یان لە نێوان چینەکانی کۆمەڵدا کە لە پێناوی چەند ئامانجێکی سیاسی‌و ئابوری‌دا رو ئەدات •• جەنگ ، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی‌یە ، واتە لە قۆناغێکی تایبەتی مێژوویی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا دەست پێ ئەکات‌و

---

(١) حزبێکی کۆنەپەرستانە بو لە ئێراندا - وەرگێر -

پەیوەندی بە هەل‌و مەرجی ژیانی کۆمەڵەوەیەو لە قۆناغێکی تری مێژوویی کۆمەڵدا تەواو ئەبێت •

لە روی مێژووییەوە پێویستی یەکەمین دەستەی چەکداری لە شکر لەگەڵ پەیدابونی ملکدرایتی تاکە کەس‌و پەیدا بونی چینەکان‌و دەوڵەت پەیدا بووە • لەو کاتەوە لە کۆمەڵگای چینایەتیدا جەنگ بە شێوەی گشتی بووە بە هۆی چەسپاندنی حوکمی چینە داگیرکارەکان‌و داگیر کردنی زەوی‌و زارو خەڵك گرتنە ژێر دەست •

لە سەردەمی ئێستادا سەرچاوەی بنچینەیی هەمو جەنگێك رێژیمی سەرمایەداری‌و ناکۆکیەکانیتی ، کە لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا ئەگاتە ئەوپەڕی توندو تیژی خۆی • تیوری شۆرشگێرانە لە بارەی جەنگەوە ئەوە نیشان ئەدات کە دو جۆر جەنگ هەیە ، وەکو : جەنگی عادیلانەو جەنگی نا عادیلانە ••

**جەنگی عادیلانە :**

ئەو جەنگەیە کە لەبەر داگیرکردنی خاکی ئەمو ئەوو هێنانە ژێر دەستی خەڵکەوە رو نادات •• بەڵکو جەنگێکی ئازا دیخوازانەیەو لە پێناوی داکۆکی لەسەر نیشتمان‌و دەسکەوتەکانی زەحمەتکێشان دا روو ئەدات • لە دژی ئیستیعمارو داگیر کاران ، دەست درێژکارانی بێگانە ، دژی کۆیلەتیی‌و هەمو جۆرە ستەمێك بەرپا ئەبێت •

**جەنگی ناعادیلانە :**

جەنگێکی سنور شکێنە لە پێناوی ژێردەستە کردنی نەتەوەکانی ترو سەرکوتکردنی زەحمەتکێشان‌و فراوانبونی دەسەڵاتی داگیرکارانە بەرپا

ئەبێت • بۆ نمونه : وەکو جەنگی ڤیتنام ، کە لە لایەکەوە هێزی ئیمپریالیستە ئەمەریکاییەکانو نۆکەرو داردەستەکانیانو لە لایەکی تریشەوە خەڵکی ڤیتنام رووبەرووی یەك ئەجەنگان •

ئەو جەنگەی ئەمەریکا هەڵی ئەگیرساند جەنگێکی سنور شکێنو دیلێتی خواز بو ، ئەو جەنگەش خەڵکی ڤیتنام ئەیانکرد جەنگێکی عادیلانە بو ، لە پێناوی بەدەست هێنانی سەربەخۆییو ئازادیو یەکێتی گەل بو • ئەوە بو لە ئەنجامدا ئەو جەنگە بوو بە جەنگێکی رەوای تەواوی خەڵکەکانی هیندو چین • لەبەر ئەوەیە کە هەر کەسێکی بەشەرەفو نیشتمان پەروەر بەرپەرچی هەمو دەست درێژییەکی ئەمەریکا ئەداتەوە کە ئەیەوێ ریژیمی ئیستیعماری ئازادیکوژی خۆی سەقامگیر کات •

تیوری شۆرشگێرانە هەمیشە بەرهەڵستی هەمو جۆرە جەنگێکی ناعادیلانەو دەست درێژکارانە ئەوەستێو داکۆکی لەسەر جەنگی عادیلانەی کۆمەڵانی خەڵك ئەکات •

یەکێك لە جۆرەکانی جەنگی عادیلانە جەنگی پارتیزانی خەڵکە ، کە بریتییە لە جەنگی چەند دەستە چەکدارێکی نارێكو پێکی خەڵك لە پشت بەرەگەی جەنگی دوژمنەوە •• لە ناوەراستی ئەو ناوچانەی کە داگیر کراوون • جەنگێکە کۆمەڵانی خەڵك بە چەندان جۆر بەرامبەر بە دوژمن ئەینوێنن • وەکو جەنگی پارتیزانی خەڵکی ئەسپانیا دژی فەرەنسەییە داگیرکارەکان لە سەردەمی ناپلیۆندا ، زیاتر لە سەدەو نیوێك لەمەوبەر(١) •• جەنگی خەڵکی روسیە لە سەردەمی پەلامارەکەی ناپلیۆندا هەر لە هەمان کاتا • جەنگی نیشتمان پەروەرە ئیتالیاییەکان بە سەرکردەیی « گاریبالدی » ، ئەویش سەدەو نیوێك لەمەوبەر(٢) ••

(١و٢) هەبەست سەردەمی نوسینی کتێبەکەیە — وەرگێر —

جەنگی فەرەنسەیەکان لە دژی ئەڵەمانیە داگیرکارەکان نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر (١) ، کە بە شێوەیەك لە شیوەکانی جەنگی پارتیزانی ناو ئەبرێت. هەروەکو جەنگی دەستەو کۆمەڵی چەکدارە پارتیزانەکانی روسیا لە کاتی جەنگی ناوخۆیی‌و دووەمین جەنگی جیهانی‌دا •

هەروەها لە ماوەی دووەمین جەنگی جیهانیدا لە فەرەنسەو ئیتالیاو یوگسلاڤیاو پۆڵەندەو بلگاریاو جیکۆسلۆفاکیاو یۆنان‌و چین‌و ڤیتنام‌و فلیپین‌و چەندان شوێنی تری بەمجۆرە •

لەم باسەدا مەفهومی مەسەلەی جەنگ مەبەستێکی تری تیایە ئەویش شەڕ کردنە لە پێناوی ئاشتی‌داو رێگرتن لەشەڕی دەست درێژکارانەی ئیمپریالیستی •• ئەوەمان وت کە سەرچاوەی بنچینەیی جەنگ ریژیمی سەرمایەداری‌یە ، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە تاکو ئەو کاتەی سیستەمی سوشیالیستی لە هەمو وڵاتەکانا ئەچەسپێ توانای بەرگیریکردن لە جەنگ نابێت‌و ئیتر لەبەردەم هەڵویستێکی دڕندەی جیهانیدا دەستە پاچە دابنیشین ، ئێستا ئەوەندە هێزی کۆمەڵایەتی نیشتمانی لە ئارادایە کە توانای ئەوەیان هەیە بتوانن رێگای جەنگی ئیمپریالیستیانە لە بەرەی ئیمپریالیزم بگرن •
لە کۆبونەوەی راوێژکاری ستراتیجی ئەم رێکخراوانە لەبارەی جەنگەوە بەمجۆرە دیاریکراوە ؟ تەنانەت لە سەردەمی ئێستاشدا ئەو هێزانەی کە توانای ئەوەیان هەبێت کۆمەڵگای ئادەمیزاد لە مەترسی جەنگێکی جیهانی تازە رزگار کەن سێ هێزی گەورەی کۆمەڵایەتین وەکو :

**سیستەمی سوشیالیستی جیهان ، راپەڕینی نیشتمانیانەی دژ بە ئیمپریالیزم • راپەڕینی شۆرشگێرانەی کرێکاران لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا •**

---
(١) لەکاتی نوسینی کتێبەکەوە ••

ئێستاش ناوەڕۆکی دەست درێژکارانەی ئیمپریالیزم شێوەیەکی، سامناکی تازەی بە خۆوە گرتووە ، لەم هەلو مەرجەدا بە گەلێك شێواز باسی بەرگیری کردن لە جەنگی دەست درێژکارانەی ئیمپریالیزم کراوە • هەندێك ئەڵێن جەنگێکی جیهانی سەرتاپاگیر کارێکی حەتمی یەو رەت کردنەوەی نیەو کەس بەرگیری بۆ لێ ناکرێت • ئەمە راکردنە لە مەسەلەکە •• هەندێکیش لەو باوەڕەدان کە بە هۆی چەکی مودیرنی هەمە جۆرەو سامناکەوە ئەو جەنگەی چاوەڕوانی ئەکرێ رو نادات • ئەمەش دیسان بیرکردنەوەیەکی ناواقیعیانەیە •• ئەرکی سەرشانی ئێستامان ئەوەیە هەمو ئەو شێوانەی بەرهەڵستی ئەم مەترسی یە ئەکەن بەکار بهێنرێن ، لەم کاتەدا کە ئیمپریالیزم هەوڵی ئەوە ئەدات لاوازی خۆی بەمکارە دەست درێژ کارانەیە بە هێز بکات •

یەکێك لە شێوەکانی ئەمڕۆی ئیمپریالیزم ئەوەیە جەنگێکی سەرتاپاگیر لە دەرەوەو ناو خۆدا هەڵبگیرسێنێ ، لەم جەنگەشدا مەبەستی ئیمپریالیزم ئەوەیە دەست لە سەنگەری سوشیالیزمو راپەڕینی ئازادیخوازانەی نیشتمانی بووەشێنێ • ئەم شێوەیە بە ئاشکرا لە رواڵەتی مانۆڕەکانیدا دەر ئەکەوێ • ئەم مانۆڕانە هەندێك جار بەپێی دەستوری تایبەتی ئیمپریالیزم روو ئەدەن ، وەکو دەست درێژکاری ئیسرائیل ، یان لە رێگای پیلانو کودتاوە ، هەروەکو کودتای ئەفسەرە یۆنانیەکان ، وە یان لە رێگای حموجوڵی هوشیارانەوە دژی وڵاتە سوشیالیستی یەکان ، وەکو روداوی کەشتی یە جاسوسی یەکەی ئەمەریکا ـ پوینلو ـ ••، لەم کاتو هەلو مەرجانەدا ئەرکی سەرەکی مێژویی سەرشانی هەمو بریتی یە لە کوێر کردنەوەو پوچکردنەوەی نەخشە دەست درێژکارانەکانی ئیمپریالیزم ، بەر لەوەی کار بگاتە رادەی جەنگ •

ئەم ئەرکەش ئەکەوێتە ئەستۆی هاریکاری
دەستەجەمعی هەرسێ هێزە ئازادیخوازە دژ بە
ئیمپریالیزمەکە ، واتە « سیستەمی سوشیالیستی جیهانی ،
راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلیو راپەڕینی کرێکارانی
ولاتە سەرمایەداریی‌ یە پێشکەوتووەکان » ٠٠

لەبەر ئەمە هەوڵدان بۆ پوچکردنەوەی نەخشە جەنگخوازی‌یەکانی ئیمپریالیزم گرنگترین مەسەلەی سیاسی ئەمڕۆو ئەرکی سەرشانی ئەو سێ دەستەیەیە ٠

سەرکەوتنی ئەم ستراتیجە ، واتە سەپاندنی شێوەی ژیانی پێکەوە بە ئاشتی ژیان بەسەر ولاتە سەرمایەداری‌یەکاندا کە شێوەیەکە لە خەباتی چینایەتیانە بە قازانجی هەرسێ لایەکەیە ٠ چونکە زەمینەیان زیاتر بۆ خۆش ئەبێت کە زیاتر گەشە بکەن‌و زیاتر سیستەمی پێشکەوتوانە بچەسپێت‌و زیاتر یارمەتی نەتەوەکانی جیهان بدرێت ٠

ئەمکارە ، بە سودی راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلی‌یە چونکە بە ئاشتی پێکەوە ژیان ریزی دەسەلاتی نەتەوەکان زیاد ئەکات‌و راپەرینی عادیلانەی نەتەوەکان لە پێناوی سەربەخۆیی‌و ئازادیدا سەر ئەخات ٠ بە قازانجی زەحمەتکێشانی ولاتە سەرمایەداری‌یەکانە چونکە ئەم خەڵکانە نابنە قوربانی کارێک کە هیچ جۆر لەگەڵ ئاواتیانا ناگونجێت‌و دوچاری مەینەتی ئاڵۆزی مادی‌و مەعنەوی نابن ٠

### جەنگی سارد :

ئەم زاراوەیە باری توندو تیژی نێوان نەتەوەکان یان نێوان ولاتە سوشیالیستی‌یەکان‌و ولاتە سەرمایەداری‌یەکان دەر ئەبڕێت ٠٠ ئەم

ژاراوەیە بەگشتی لە دوای دوەمین جەنگی جیهانی پەیدا بووە ، لە کاتێکدا کە دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان رەووشتی دەست درێژکارانەو خراپە کاری خۆیان ئەنواندو بەرگیری‌یان لە هەمو جۆرە پەیوەندی‌یەکی دۆستانەی نێو دەوڵەتەکان ئەکردو مشت‌و مڕیان لە نێوانیاندا ئەنایەوەو ئەیانکردن بەگژ دەوڵەتە سوشیالیستی‌یەکانا •

دەستێوەردانی ئیستیعمار یانەیان لە دژی راپەڕینی نەتەوە ئازادیخوازەکان دەست پێکرد • باری ناوخۆی دەوڵەتەکان توندو تیژ ئەبو بێ ئەوەی شەڕێکی دەستەو یەخەیی لە نێوانیاندا هەبایە ، پەیوەندی نێوانیان تاریکتر ئەبو • هەزاران جۆر جموجوڵو لێك سڵەمینەوەو دودڵی بە پێچەوانەی سەردەمی ئاشتی‌یەوە لە نێو وڵاتاندا ئەخولقا •• وڵاتە ئیمپریالیستیەکان لە پێناوی ئامانجی ئیستیعمار گەرانەی خۆیاناو مەحکەمکردنی دەسەڵاتیان پەنا ئەبەنە بەر جەنگی سارد •

شیوازی جەنگی سارد ، لە دوای دوەمین جەنگی جیهانی‌یەوە یەکەمین جار وینستون چەرچل لە « فولتن » باسی کردوە • ئیمپریالیستی ئەمەریکا کردی بە سیاسەتی رەسمی خۆی • مەبەست لە سیاسەتی ئاشتیخوازانەو بە ئاشتی پێکەوە ژیان کە دەوڵەتە نیشتمانیەکان لەسەری ئەڕۆن بە زۆری مەبەست کۆتایی هێنانە بە جەنگی سارد • چونکە جەنگی سارد گەلێك گیرو گرفت ئەخاتە رێی گەشە کردنی خەڵكو رزگاری گەلانەوە •

سیاسەتی جەنگی سارد ، زیاد لە رابوردو دوچاری ناکامی ئەبێت‌و ئەبێتە هۆی تاك خستنی ئیمپریالیستی ئەمەریکا •• تێکشکانی یەکجارەکی سیاسەتی جەنگی سارد ئەبێتە هۆی سەرکەوتنی ئاشتی‌و پێکەوە بە ئاشتی ژیانی هەمو گەلان •

## جیهان بینی :

بریتی‌یە لە سیستەمی تیوری‌یەکان ، تێـگەیشتن لە بارەی جیهانەوە ، ئەم زاراوەیە هەمو تیوری‌یەکانی ئادەمیزاد لە بارەی جیهانەوە ئەگرێتەوە • هەر لە تیوری بیروباوەڕو فەلسەفی‌و کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌یەوە تا ڕەووشتی‌و هونەری‌و ئەو مەسەلانەی پەیوەندی‌یان بە زانستی سروشتەوە هەیەو •••، بە مەفهومێـکی ئاشکراتر زاراوەی جیهان بینی‌و ناوەڕۆکی بریتی‌یـە لـە تیوری بیروباوەڕو فەلسەفی •• گرنگترین مەسەلەی جیهان بینی هەمـان مەسەلەی بنچینەیی فەلسەفەیە • ئەتوانین هەمو جیهان بینی‌یەکان بکەیـن بە دوو بەشەوە :

١ـ ماتەریالیسـتی •

٢ـ ئایدیالیسـتی •

جیهان بینی ، تیشکدانەوەی ناخی کۆمەڵەو پەیوەنـدی بە ئاسـتی زانستی‌و هوشیاری ئادەمیزادەوە هەیە لە هـەر قۆناغێـکی دیاریـکراوی مێژوودا هەروەکو پەیوەندە بە ڕیژیمی کۆمەلاّیەتیشەوە •

لە کۆمەڵگای چینایەتیدا ، جیهان بینـی ماهیەتێـکی چینایەتیـانەی هەیە ، ئاشکرایە جیهان بینی چینی فەرمانڕەوا لە هەر کۆمەڵگا یەکدا بێت جیهان بینی چینی دەسەلاّتدارە •• جیهان بینی ئەهمیەتێـکی زۆر بەکـار کردن ئەدات • چونـکە پەیوەندی‌یەکانی ئادەمیزاد بە جیهان‌و سروشت‌و کۆمەڵەوە ئەدۆزێتەوەو یەکیان ئەخات‌و یارمەتی گەشە کردن‌و پێشکەوتنی قازانجی پێشـکەوتنخوازەکان ئەدات •

جیهان‌بینی نازانستیانەو کۆنەپەرستانەش خزمەتـی چیـن‌و هێـزە دەسەلاّتـدارە داسەپوەکـان ئەکـات • ڕێـگا لە گەشـەکردنی کۆمـەڵ

ئەگرێت .. داکۆکی لەسەر چینە چەوسێنەرەوەکان ئەکات ، بەرهەڵستی ڕاپەڕینی زەحمەتکێشان ئەوەستێ .

جیهان بینی شۆرشگێڕانە ، بە شێوەیەکی فراوان جیهان بینی‌یەکی زانستیانەی تەواوە ، ئەم جیهان بینی‌یە زانستیانەیە قازانجی پرۆلیتاریاو هەمو زەحمەتکێشان ئەپارێزێت . لە گەل یاساکانی گەشە کردنی کۆمەڵدا ئەگونجێت .. لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا ئەبێتە جیهان بینی ئەواوی خەڵك . ڕاستی‌و زانستێتی جیهان بینی شۆرشگێڕانە هەمو مێژووی کارکردنی ئادەمیزاد ، ژیان ، هەمو دەسکەوتەکانو زانیاری مرۆڤ ئەسەلمێنێت .

### ● چین ـ طبقە

**تیوری زانەکان بەمجۆرە باسی چینەکانی کۆمەڵیان کردوە :**

« چین بەو کۆمەڵە خەڵکانە ئەڵێن کە لە چەندان ئەندام پێك هاتوون ، هەریەکە بە پێی جێگاو شوێنی خۆی لە سیستەمی بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتی‌و ڕۆژگاری مێژوویی دیاریکراوو بە پێی پەیوەندی خۆی لەگەڵ هۆیەکانی بەرهەم هێنانداو بەپێی ڕێگای هێنانە دەستو کێشی دەسکەوتی لە بواری سامانی کۆمەڵایەتیدا ، هەریەکەیان لە وانی تر جیایە .

چینەکانی کۆمەڵ ، ئەو کۆمەڵ خەڵکانەن کە هەندێکیان بەهۆی پلەو پایەی دیارکراویانەوە لە بواری ئابووری‌و کۆمەڵایەتیدا ئەتوانن دەست بە سەر کاری کۆمەڵەکانی تردا بکرن » .

بەپێی ئەم لێکدانەوەیە جیا کردنەوەی چینەکان لەیەکتر بەشێوەی گشتی بەپێی پلەو پایەیان لە بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتیدا دیاری ئەکرێ •• جۆری پەیوەندی چینەکان لەگەل هۆیەکانی بەرهەم هێنانـدا گرنگترین هـۆی دیار یکردنی راژەی چینەکانـە لە بەرهـەم هێنانی کۆمەڵایەتیانەدا •

خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنانو ئەو زەحمەتکێشانەی کە هـۆی بەرهەم هێنانیان نیە هەر یەکەیان شوێنو پلەیەکی جیاواز لە یەکتریان هەیە لە بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتیدا • یەکێکیان فەرمانڕەوایە ئەویتریان بەردستە • یەکێک رەنجدەرو ئەویتریش رەنجەکە ئەبات ••

چینەکانی کۆمەڵ دیسان بە پێی چونێتیو باری دەسکەوتی خۆیانەوە لە بەرهەمی کۆمەڵایەتیدا لە یەکتر جیا ئەکرێنەوە • بۆ نمونە لە جیهانی سەرمایەداری‌دا ، سەرمایەدارەکان سود وەر ئەگرنو کرێکارەکان لـە بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتیدا رەنج ئەدەن • بەو جۆرە جیاوازی‌یەکی ئاشکراو گەورە لە نێوان ئەو دو چینەدا هەیە •

بەمجۆرە بە ئاشکرا دیارە کە تیوری شۆرشـگێرانە چینەکانی کۆمەڵو بنچینەی دابەشکردنی کۆمەڵ بە چەندان چینی جۆربەجۆر لەناو سنوری بەرهەم هێنانی مادی‌دا دیاری ئەکات •

بەو جۆرەی کە مێژوو نیشانی داوە لـە سـەرەتای پەیدابونی ئادەمیزاددا چینایەتی نەبـوە ، کۆمەڵگای سـوشیالیستی یان کومونی سەرەتایی کۆمەڵگایەکی بێ چینایەتی بووە ، پەیوەنـدی هـەمو کەسێک لەگەل هۆیە سەرەتاییەکانی بەرهەم هێناندا وەکو یەك بـووە •• ئاستی بەرهەم هێنان ئەوەندە نزم بووە کە تەنیا خۆراکی رۆژانەیان بەدەست ئەهێناو

توانای پاشەکەوتو خاوەن ملـکداریتی تایبەتی‌و یەکتر ژێر دەستە کردن ، بە هۆی پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنانەوە نەبووە •

لەگەل گەشە کردنو زۆر بونی هێزەکانی بەرهەم هێنانو بەرهـەم هێنانی زیاد لە پێویستی رۆژانەو پاشـەکەوتو دابەشـکردنی کـاری کۆمەلایەتی‌و پەیدا بونی ملـکداریتی تایبـەتی‌و لەناوچونی ملکداریتی سوشیالیستی کێشی ئابوری خەلك زیادو کەمی کرد •

هەندێـك ، بە تایبەتی ئەوانەی کە سەرەك هۆزەکان بون دەولەمەند بونو بونە خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنان •• هەندێـکیش لەوە بێبەش بون ناچار بون کار بۆ خاوەنی هۆیەکانی بەرهەم هێنان بکەن ، ئەم جیا کردنەوەی توێژە کۆمەلایەتیانە لـە یەکترو گەشە کردنیان بوو بە هۆی پەیدا بوونی کۆمەلـگای کۆیلەیی •

هەریەك لە فرماسیونە کۆمەلایەتی‌و چینایەتیەکان خاوەنی رەووشتی چینایەتیانـەی تایبەتـی خۆیەتـی ، لـە کۆمەلـگای کـۆیلەیدا چینـە سەرەکی‌یەکان بریتی بون لە کۆیلەکانو خاوەن کۆیلەکان ، لە کۆمەلـگای فیودالی‌دا بریتی بون لە خاوەن ملكو جـوتیارەکـان ، لە کۆمەلـگای سەرمایەداری‌دا بریتی‌یە لە پرۆلیتاریاو بۆرجوازی‌یەکان ، لە هەریەك لەم سەردەمانەدا جگە لەو چینە بنچینەییانەی ناومان بردن دیسان چینـی لەمانە بچوکتریش هەیە ، ئەوانە لەگەل چینە تازەکاندا لە حالەتی گەشـە کردندانو لەگەل ئەو چینانەشـدا کە لـە حالەتـی تواندنـەوەدان دور ئەکەونەوە • بەلام چینی کرێـکار رۆلێـکی گەورە لە کۆمەلدا ئەگێڕێ‌و خاوەنی پەیامێـکی مێژوویی تایبەتی‌یە ، چونکە لە پێناوی سەقامگیر بونی سوشیالیزمدا تێ ئەکۆشێ‌و هەولی ئەوە ئەدات کۆمەلـگایەکی بێ چینایەتی دابمەزرێت •

کەوابو [ چین ـ طبقة ] دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مێژوییە لە سەرەتاوە لە سەردەمی کۆمونی سەرەتاییدا نەبوە ، لە سەردەمی کمونیزمیشدا دیسان لەناو ئەچێت •

بە پێی باری سەرنجی مەفهومی زانستیانەی چین کە وەکو لەسەرەوە باسمان کرد ئەو زاراوە تایبەتیانەی لە بارەی چینەکانەوە لە رۆژنامەو چاپەمەنیەکانا بەرچاومان ئەکەوێت وەکو چینی رۆشنبیرانو کرێکارانو ئافرەتانو سنعەتکارە دەستییەکانو ئەمجۆرە شتانە شتێکی راست نیە ، چونکە ئەمانە هەریەکە توێژێکی تایبەتی کۆمەڵ یان جنسێکی تایبەتینو تێکەڵ کردنیان لەگەل یەکترو بە ناوی چینەوە پێچەوانەی باری سەرنجی شۆرشگێرانەیە • هەرچەند ئەمانە قازانجیان هاوبەش بێتو هەر توێژەی لە چەندان ئەندامی کۆمەڵ پێک هاتبێت •

● حزب Party

« چەند زاراوەیەك لە بارەی ئۆرگانەکانی حزبەوە »:

بریتییە لەرێکخراوێکی سیاسی کەهاوبیرانو لایەنگرانی ئەو رێبازە سیاسییە لەسەر ئارەزووی خۆیان یەکیان تیا گرتۆتەوە ، بە گشتی هۆشیار ترین عونسوری چینێك یان توێژە کۆمەڵایەتییەکان کە قازانجیان یەك ئەگرێتەوە تیا کۆ ئەبنەوە •

حزب داکۆکی لەسەر قازانجی ئەو کۆمەڵانە ئەکاتو رابەرییان ئەکات •• لە کاتی گەشەکردنی سەرمایەداریدا چەندان رێکخراوی سیاسی پرۆلیتاریاو بورجوازی کە دو چینی سەرەکی کۆمەڵگای سەرمایەدارینو چەندان رێکخراوی سیاسی چینەکانی کۆمەڵ پێک دێن • هۆی بنچینەیی زۆری حزبی بورجوازی لە هەندێك لە وڵاتە

سەرمایەداری‌یەکانا ئەوەیە ئەو کۆمەڵگایە چەندان چین‌و توێژی تیایەو لە پێناوی بە دەست هێنانی حوکم‌دا بەربەرەکانێی یەکتر ئەکەن •

جگە لەوەش بۆرجوازی سود لە بوونی زۆری حزب وەر ئەگرێت‌و کۆمەڵانی خەڵك بە روخساری جیاجیا هەڵئەخڵەتێنێ ، بۆ ئەوەی لەسەر رێگای راستی خەباتی چینایەتی خۆیان لایان بدات •• لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا دەزگا ئینحیساری‌یەکان‌و هاوکارەکانیان بەرامبەر بە راپەرینی کۆمەڵانی خەڵك پەنا ئەبەنە بەرحوکمی دیکتاتۆریانەو کوشتن‌و برین‌و تۆقاندن • چەندان حزبی فاشیست(١) بۆ مەبەستی‌خۆیان دائەمەزێنن • چونکە حزبە فاشیستەکان لە واقیع دا داردەست‌و هێزی دەست وەشێنەری سەرمایەدارین •

بۆرجوازی لە رێگای ئاریستوکراسی کرێکارانەوە هەوڵ ئەدات رێکخراوی ریفۆرمیستی بۆ کرێکاران دابمەزرێنێ‌و بیانخڵەتێنێت •• رێکخراوی پرۆلیتاری ، رێکخراوی سیاسی شۆرشگێرانە ئەمانە قازانجی کۆمەڵانی خەڵك ئەپارێزن •• تەنیا رێکخراوە شۆرشگێری‌یەکان ئەتوانن رابەری راستەقینەی راپەرینی چینایەتی زەحمەتکێشان بگرنە ئەستۆی خۆیان‌و رابەری یان بکەن •

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا ، کاتێك شۆرشی گەلان وەکو ئەرکێکی عەمەلی دێتە کایەوە لەو کاتەدا رێکخراوە شۆرشگێریەکان رۆڵێکی گرنگ دیاری ئەکەن •

---

(١) وەکو حزبی «نازی» لە ئەڵەمانیای هیتلەری دا •
– وەرگێر –

## ● خود موختاری Self - Determination

بریتی‌یه له سه‌ربه‌خۆیی سیاسی نه‌ته‌وه‌کان‌و دور بونیان له ژێر ده‌سته‌یی ده‌ره‌وه ، له‌م سه‌رده‌مه‌دا سه‌ربه‌خۆیی یان خودموختاری که‌مایه‌تیه‌کان‌و ناوچه ژێر ده‌ستی‌یه‌کان‌و پاراستنی ده‌وڵه‌ته بچوکه لاوازه‌کان ئه‌رکی سه‌رشانی رێکخراوی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کانه •

یاسای خودموختاری نه‌ته‌وه‌کان له‌گه‌ل راپه‌رینی سه‌ربه‌خۆیی خوازانه‌ی نه‌ته‌وه‌کانی ئه‌وروپادا له سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌مدا گه‌شه‌ی کردو بلاو بۆوه •• به پێی ئه‌م یاسایه هه‌مو نه‌ته‌وه‌یه‌ك مافی ئه‌وه‌ی هه‌یه که ده‌وڵه‌تێکی سه‌ربه‌خۆ بۆ خۆی پێك بێنێت‌و خۆی حکومه‌تی خۆی هه‌ڵ بژێرێت •• بلاو بونه‌وه‌ی بیری ناسیونالیستی‌یانه له ئه‌وروپاو کارتێکردنی بۆ کیشوه‌ره‌کانی تر گه‌لێك راپه‌رینی نه‌ته‌وایه‌تیانه‌ی له ولاته‌کانی تری جیهاندا خولقاندو یاسای خودموختاری نه‌ته‌وه‌یی کرد به شێوه‌ی یاسایه‌کی بنچینه‌یی له بواری په‌یوه‌ندی نێو نه‌ته‌وه‌کاندا •

گیروگرفتی هه‌ره گه‌وره‌ی خودموختاری له‌وه‌دایه که ئایا ئه‌و نه‌ته‌وه‌یه ، یان ئه‌و کۆمه‌ڵه خه‌ڵکه مافی خود موختاری‌یان هه‌یه یان نه‌ء ؟ نوسراوه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان ناوی ئه‌و نه‌ته‌وانه‌یان ده‌ست نیشان نه‌کردوه که مافی خودموختاری‌یان هه‌یه • به‌ڵکو چاره‌نوسی هه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌ك به‌ستراوه به بون‌و واقیعی خۆیه‌وه •• به‌لام به شێوه‌ی گشتی ئه‌و نه‌ته‌وانه‌ی که به ئاشکرا هێڵێکی دیار له نێوان ئه‌وان‌و نه‌ته‌وه‌یه‌کی ترا ، یان ده‌وڵه‌تێکدا هه‌یه ، ئه‌وه مافی خودموختاری‌یان هه‌یه •

ئیستا ده‌وڵه‌ته گه‌وره‌کان په‌لاماری زۆر شوێن‌و نه‌ته‌وه ئه‌ده‌ن‌و گه‌مارۆی عه‌سکه‌ری‌یان ئه‌ده‌ن به‌و بیانووه‌وه گوایه داکۆکی له‌سه‌ر قه‌واره‌ی سیاسی‌و خودموختاری‌یان ئه‌که‌ن •

خودموختاری زۆر جار بە مانای سەربەخۆیی دیاریکراوی نەتەوەیی وەکو Autonomy بۆ کەمایەتی‌یە ئایینی‌و نژادی‌یەکانی نێــو وڵاتێــک یەن گەلێك لە نێو وڵاتێــکی گەورە یان ئیمپەراتوریتێکدا بەکار هێنراوە •

● **دسپوتیزم** Despotisme

بەو دەسەڵاتە ئەوترێت کە هیچ سنورێــکی یاسایی‌و نەریتی نەبێت‌و خۆی سەرپشکی هەمو کاروبارێــکی سیاســی‌و ئابــوری‌و عەســکەری‌و ئیداری‌و دارایی بێت•• دسپوتیزم بە گشتی مانای خراپ‌و هاوشانی ستەمی هەیە ؛ بەڵام هەندێــک جاریش باسی « دسپوتیزمی رۆشنبیرانە » ئەکرێ کە مەبەست لەو جۆرە حکومەتە ئایدیالیستیانەیە کە ئەفلاتون‌و هەندێــک لە رۆشنبیرەکانی دەورو بەری داوایان ئەکرد •

فیتفوگل[١] کۆمەڵ شوناسی ئەڵەمانی مەفهومێــکی تازەی بە ناونیشانی دسپوتیزمی رۆژ هەڵات » بۆ دسپوتیزم داناوە ، مەبەستی لەو کۆمەڵگایەیە ئەم خاسیەتانەی خوارەوەی تیا بێت :

١ ـ حکومەتی تاکەکەسی « ئوتوکراسی[١] »
٢ ـ شیرازەی وڵات بەسترابێت بە ناوەندی دەوڵەتەوە
٣ ـ نەبونی یاسایەکی هەمیشەیی
٤ ـ لەو کۆمەڵــگایەدا پلەو پایەی بازرگــانەکان نــزم بێت •
٥ ـ بایەخ نەدان بە کۆیلەداری •
٦ ـ کشتوکاڵ بە ئاودێری فراوان بێت •

---

(١) K. A. Witfogel
(١) Autocracy:

به بیروڕای فیتفوگل خاڵی دوایی بنچینەی خاسیەتەکانی تره ، ئەمجۆرە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیو سیاسی یە جگە لە چەند نەتەوەیەکی ئاسیایی شارستانێتی پێست سورەکانی ئەمەریکاش ئەگرێتەوە •

● **دوگماتیزم** Dogmatisme

زاراوەی « دوگم » بە مانا [ وەستاو ] ئەگرێتەوە ، ئەو کارەی کە هەرگیز نابێ بگۆڕدرێ ، بەو شێوازو بیرکردنەوەیە ئەوترێ کە لەسەر پایەی مەفهومی « نەگۆڕ » دامەزرابێت • وەکو یاساو دەستورە ئاینییەکان ، بێ ئەوەی پەیڕەوی دەسکەوتە تازەکانو زانستیو کاری زانستییانە بکات ، بێ ئەوەی بە پێی هەلو مەرجی تایبەتی شوێنو کات بجوڵێتەوە ••

دوگماتیزم لە بەر باری سەرنجی فەلسەفیانەوە ڕاوەستانی واقیع ئەگرێتەوە ، واتە واقیع بە هەلو مەرجی کاتو شوێنەوە نابەستێتەوە • لە فەلسەفەی هاوچەرخدا دوگماتیزم بە پاشکۆی شێوازی دژی دیالەکتیك دائەنرێ کە هەمو جۆرە جموجوڵێکی جیهانو گەشە کردنی شتو دیاردەکان ڕەت ئەکاتەوە •• یەکێك لە مەینەتەکانی دوگماتیزم ئەوەیە کە هەست بە یاساکانی دیالەکتیك ناکات وەکو گەشە کردن لە هەلو مەرجی جۆربەجۆری مێژوویدا •

لەبەر باری سەرنجی مێژوویشەوە پەیدا بونی دوگماتیزم لەگەل پەیدابونی ئاینەکانو باوەڕ بە ئاینەکان پەیدا بووە ، کە واقیع بە شتێکی هەمیشەیی وەستاوو نەگۆڕ ئەزانێت • ئەمجۆرە بیر کردنەوەیە لە ئەنجامدا بووە فەلسەفەو زانینو سیاسەت •

لەبەر باری سەرنجی سیاسیشدا دوگماتیزم ئەبێتە کاریکی سکتاریستی ، وەستان ، ڕەتکردنەوەی تیوری داهێنەرانە ، جیا کردنەوەی

تەواوی تیوری‌و پراتیك لە یەكتر • دوگماتیزم هەروەكو ریفیژیۆنیزم لە هەل‌و مەرجی ئیستادا مەترسی‌یەكی گـەورەی لەبـەردەم راپەڕینـی نێـو نەتەوەیی كرێـكاراندا هەیە •

دوگماتیكەكان باوەڕیان بە گۆڕین‌و گەشە كردن نیە ، هەمیشە پەنا ئەبەنە بەر شێوازو یاسای مەیبوو نەگۆڕو كۆنە •• هەزاران ناوو ناتۆرە ئەدەنە پاڵ عونسوری شۆرشـگێڕو یاسـا گشـتی‌یەكانی دیالەكتیـك • رێـكخراوە شۆرشگێڕی‌یەكان هەمیشە ئامۆژگاری ئەندامەكانی خۆیان ئەكەن كە لە رەووشتی دوگماتیكانە دور بكەونەوە •

## ● دیماگۆجی Demagoge

دیماگۆجی ، بە « ساویلكە خڵەتاندن » یان « خەڵك فریودان » لێك دراوەتەوە ، دیماگۆجی بەو خەڵك خڵەتاندنە ئەڵێـن لە رێـگای بەڵێـن‌و دروشمی درۆوە چاوبەستیان لێ بكرێ • دیموگۆك ، ئەو كەسانەن هەوڵ ئەدەن بە درۆو فیشاڵ خەڵك بۆ لای خۆیان رابكێشن‌و راستی لەبەرچاوی خەڵـكی بشارنەوە ، دیماگۆجی باشترین نمونەی سیاسەت‌و شێوازی كار كردنی سیاسیانەی حزبە بۆرجـوازی‌یەكـان‌و دەوڵەتـە دژ بـە خەڵـكە كانن •• ئەو دەوڵەتانەی دژی خەڵكن هەول‌ئەدەن لە رێـگای دەزگاكانی راگەیاندنەوە وەكو : رادیۆ ، تەلەفزیۆن ، رۆژنامە ، ئاگاداری دەركردن ، ریپۆرتاج ، چاو پیكەوتن‌و •••• ئەمجۆرە شتانەوە خەڵـكی سادەو ساویلكە بخڵەتێنن‌و باری سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆیان رابكێشن •

دیماگۆجی یان خەڵك خڵەتاندن ، یان خەڵك فریـودان ، لەگـەل سیاسەت‌و رێبازی راپەڕینی مەنطقیانەی رێـكخراوە شۆرشگێڕی‌یەكانـا ناگونجێ‌و هەمو پێشكەوتنخوازێـك لەو رێبازەوە دورە •

● **دیموکراسی** Democratie

دیموکراسی یان دیموکراتی ، زاراوەیەکی یۆنانی‌یە « دیمو » بە مانا خەڵكو « کراتوس » دەسەڵات ئەگرێتەوە ، واتا دەسەڵاتی خەڵك یان دەسەڵاتی گەل •• دیموکراسی جۆرە دەسەڵاتدارێتی یەکی تایبەتیە کە دەسەڵات بە دەست زوربەی خەڵکەوە بێت • بەربەستی لە ئازادی نەکرێ ، ئەندامانی کۆمەڵ وەکو یەك یەکسان بن ، کۆمەڵ شوناسە بۆرجوازی‌یەکان دیموکراسی لە بابەتەکانی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی جیا ئەکەنەوە ، باری واقیعی‌و عەمەلی کۆمەڵ لەبەر چاو ناگرن • ئەمجۆرە لێکدانەوە بۆرجوازی‌یانە ماهیەتی چینایەتی کۆمەڵو ناکۆکی‌و راپەڕینی چینایەتیانە رەت ئەکاتەوە•• ریفۆرمیستەکان ئەمجۆرە دیموکراسیەتە یان ئەوێتو هەولی بۆ ئەدەن •

شێوەو ناوەڕۆکی دیموکراسی بە درێژایی مێژوو پێگەیشتووەو هەمیشە بە فرماسیونی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری‌یەوە پابەند بووەو پەیوەندی یەکی توندو تۆلی لەگەل راپەڕینی چینایەتیدا هەیە •

لە کۆمەڵگای چینایەتی پڕ لە ناکۆکی‌دا دیموکراسی تەنیا بۆ دەسەڵاتداران‌و چینی فەرمانڕەوا هەیە •• لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا دیموکراسی یەکێکە لە شێوەکانی حوکمو دەسەڵاتداری چینی بۆرجوازی •

روخساری تایبەتی دیموکراسی بۆرجوازی بریتی‌یە لە پارلمانتاریسم •• لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا تەنیا هێزی راپەڕیوی خۆراگری زەحمەتکێشان ئەتوانن ئازادی‌یە دیموکراتی‌یەکان بپارێزن‌و بەر لە کۆنە پەرستی‌و دیکتاتوری‌و فاشیزم بگرن • بورجوازی لە هەر شوێنێکدا بۆی بکرێ دیموکراتیەت پێ شێل ئەکات ، بۆ ئەم مەبەستە

له زوربه‌ی وڵاته‌کانا ڕێژیمی تیرۆریستی‌یان دامه‌زراندووه • په‌نا ئه‌به‌نه به‌ر میلیتاریزم‌و فاشیزم بۆ ئه‌وه‌ی به‌هۆی ئه‌وانه‌وه خۆیان بگرنه‌وه‌و خۆیان بپارێزن •

له به‌رنامه‌ی کاری کۆنفرانسی نێونه‌ته‌وه‌یی ڕێکخراوه شۆڕشگێڕی‌و کرێکاری‌یه‌کانا له ساڵی ۱۹٦۹ دا به‌مجۆره باسی ئه‌همیه‌تی ڕاپه‌ڕین له ڕێگای دیموکراتی‌دا کراوه :

« ڕاپه‌ڕینی دژی ئیمپریالیزم که ئه‌یه‌وێ ئازادی‌یه بنچینه‌یه‌کانی ئاده‌میزاد له ناو ببات ، پێویستی به جه‌نگێکی درێژ خایه‌ن هه‌یه ، بۆ به‌ده‌ست هێنانی ئازادی چاپه‌مه‌نی ، کۆبونه‌وه ، خۆنیشاندان ، ڕیکخستن ••• له پێناوی یه‌کسانی مافی ئه‌ندامانی خه‌ڵك‌و دیموکراتیزه‌کردنی هه‌مو ڕوکاره‌کانی ژیانی کۆمه‌ڵ • هه‌روه‌ها پێویسته دژی هه‌رجۆره هه‌وڵدان‌و یاسایه‌ك بین که کۆنه په‌رستان به نیازی له ناوبردنی مافی ئازادی‌یه دیموکراتی‌یه‌کان دای ئه‌نێن •• ئازادی‌یه دیموکراتی‌یه‌کان به‌رهه‌می خه‌بات‌و ڕاپه‌ڕینی درێژ خایه‌نی چینه‌کانن ، چ له بواری نه‌ته‌وایه‌تی یان له بواری نێو نه‌ته‌وه‌ییدا ••• » •

### ● ده‌وڵه‌ت Repoplice

ده‌وڵه‌ت ڕێکخراوێکی سیاسی کۆمه‌ڵ‌و گرنگترین هۆی ده‌سه‌ڵات گرتنه ده‌ستی چینێکه که له ڕووی ئابوری‌یه‌وه ڕۆڵێکی گرنگ له کۆمه‌ڵدا ئه‌گێڕن • ئه‌رکی سه‌ره‌کی ده‌وڵه‌ت هێشتنه‌وه‌ی ڕێژیمی

ئابوری‌و داکۆکی کردنه لەسەر چینی فەرمانڕەوا ‥ لەبەر باری سەرنجی مێژوویدا دەوڵەت لە کاتی پەیدابوونی کۆمەڵگای چینایەتی‌یەوە ئەویش پەیدا بووە • لەو کاتەوە کە کۆمەڵ دو چین بون واتا « کۆیلەو کۆیلە دارەکان » ، دەوڵەتیش وەکو ئۆرگانێکی سیاسی بۆ پاراستنی قازانجی خاوەن کۆیلەکان لە دژی کۆیلەکان پێک هاتووە • دەوڵەت بەڕێوە بردنی ئیش‌و کارو ئەرکەکانی خۆی خستۆتە سەر دەزگاکانی لەشکر ، پۆلیس ، ئەمن ، بەندیخانەکان‌و هینی تر ‥ دەوڵەتەکان جیاوازی لە نێوان جۆرو شێوەکانیانا هەیە ، هەر دەوڵەتێک ڕێژیمی ئابوری خۆی ، خۆی دەست نیشانی ئەکات‌و جۆرەکانی دیاری ئەکات • لە دەروونی مێژوودا ٣ سێ جۆر دەوڵەت پەیدا بووە :

١ـ دەوڵەتی کۆیلەداری •

٢ـ دەوڵەتی فیودالی « دەرەبەگایەتی » •

٣ـ دەوڵەتی سەرمایەداری •

لە هەریەك لە ڕۆژگاری کۆمەڵایەتی ـ ئابوری هەر دەوڵەتێکدا جۆری دەوڵەت تایبەت‌و جیاوازە ، ماهیەتی چینایەتی‌و ئابوری هەر کۆمەڵێك جۆرو ڕوخساری دەوڵەتەکەی دیاری ئەکات • جۆری دەوڵەتەکان بە زۆری پابەندن بە هەل‌و مەرجی مێژوویی کۆمەڵەوە • بۆ نمونە کۆماری‌و سەڵتەنەتی هەردوکیان هەر دەوڵەتن‌و هەر یەك لەمانەش جۆرو ڕوخسارێکی جیا لەویتری هەیە ‥ وەکو سەڵتەنەتی مەشروطە « مەرجدار » یان سەڵتەنەتی زۆرداری ، کۆماری لەگەل دەسەڵاتی پارلماندا یان کۆماری بە ئارەزوی سەرەك کۆمار • بەڵام شێوەی دەوڵەتەکان بە پێی ڕۆژگارو دۆخی وڵاتەکە ئەگۆڕدرێت •

## ● دیالەکتیك Dialectic

مانای دیالەکتیك جموجوڵی راستی‌یە لە رێگای وتووێژەوە ، هەروەها بەماناش گفتوگۆ ئەگرێتەوە لە رێگای پرسیارو وەڵامەوە ، یەکەمجار زنوونالثایی ئەمەی دۆزیوەتەوەو ئەفلاتون گەشەی پێ داوە •

هیگل ئەم وشەیە بە مانای تازە لێکداوەتەوەو ، وەکو فەلسەفەی گشتی لێکردووە ، دیالەکتیکی هیگل فەلسەفەیەکە ئەڵێت : هەمو شت پێکەوە پەیوەندیدارن ، هەمو شت لە جوڵانو گۆڕینی هەمیشەییدایە ، ئەم گۆڕانەش بە پێی یاسایەکی دیارو مەعقول روو ئەدات • لەو یاسایەدا « ناکۆکی » دەورێکی گەورە ئەبنێت • گۆڕین لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیانەوە پەیدا ئەبێت • بەڵام لە کاتی گۆڕاندا ناکۆکی‌یەکان یەکانگیر ئەبن ، واتە یەك ئەگرنو ئەمەش پێی ئەڵێن [ یاسای یەکگرتنی ناکۆکی‌یەکان ]•• لە واقیع دا لە هەر راپەڕینێکدا یەکێتی یەك خۆی شاردۆتەوە ، لە ئەنجامدا دیالەکتیك ئەوە ئەسەلمێنێ کە هەمو گۆڕینێك لە کۆتاییدا ، دوای ئەوە کە کێشەی نێوان ناکۆکی‌یەکان گەیشتە قۆناغێکی تایبەتی لەناکاو هەمو رێك ئەکەوون، وە لەو رێکەوتنە شتێکی تازە پەیدا ئەبێت کە روخسارو ناوەرۆکێکی تازەی ئەبێت •

تیوری زانەکان دیالەکتیکی هیگل یان بۆ دەرخستنی مادی مێژوو بەکار هێناوەو فەلسەفەکانی خۆیشیان ناو ناوە « ماتەریالیزمی دیالەکتیك » • بەرامبەر بە ئایدیالیزمی دیالەکتیکی هیگل •• شێوازی دیالەکتیکی ئەو تیوری زانانە بەمجۆرەیە :

أ ـ دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك هەمو سروشت پێکەوە پەیوەندیدار دائەنێت ، کە لە سروشتدا هەمو جۆرە دیاردە وشتومەکێك پێکەوە

بەندن‌و یەکتر تەواو ئەکەن ، یان یەکتر دیاری ئەکەن •

ب ـ دیالەکتیك پێچەوانەی میتافیزیك ، لەو باوەڕەدایە کە سروشت هەمیشە لە حاڵەتی گۆڕاندایە ، وە هەمیشە تازە ئەبێتەوە •

ج ـ دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك ، هەنگاوەکانی گەشە کردن بە گۆڕینێکی لەسەر خۆو سادە دانانێت ، بەڵکو بە گۆڕینی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تری دائەنێت •

د ـ دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك ناکۆکی دەرونی لەناو هەمو دیاردەکانی سروشت دا بەدی ئەکات ، لێکدانی ئەم ناکۆکی‌یانە بە بنچینەی گەشە کردن دائەنێت •

● **دیپلۆماسی** Diplomacy

ئەم زاراوەیە لە وشەی « دیپلۆمات »ی فەرەنسەیی‌یەوە هاتوە کە بە مانا نوێنەری سیاسی دەوڵەتێک ئەگرێتەوە لە دەوڵەتێکی تردا ، وە هەروەها لە وشەی « دیپلوما »ی یۆنانی‌و لاتینی وەرگیراوە کە ئەویش بە مانا قاقەزی تاکە پەڕە سەنەدو مۆر ئەگرێتەوە •

**دیپلوماسی لە زانستی سیاسەتدا (٣) سێ مانای هەیە :**

**یەکەم :**

فراوانترین مانای دیپلۆماسی پەیوەندی سیاسی نێوان دو دەوڵەتە ، تیوری زانە سیاسی‌یەکان دیپلۆماسی بە مانای

عونسورێکی دەسەڵاتی گەل ئەزانن‌و هەندێکی تریش بە تەنیا هۆی بەڕێوەبردنی کارو باری سیاسی خەڵکی دائەنێن • لەم دواییانەدا دیپلۆماسی وەکو هۆو رەووشتی رێبازی ریژیم دانراوە •

**دووەم :**

هونەری خۆ سازاندن لە سیاسەتی نێو دەوڵەتاندا کە لە جیاتی مەترسی قازانج‌و ئاسایشی وڵات بپارێزێت‌و بەهێز تری بکات •

**سێیەم :**

دیپلۆماسی وەکو دەزگایەکی کار گوزاری پەیوەندی نێو دەوڵەتان ناو ئەبرێت • یەکێك لە گرنگی‌و نرخی دیپلۆماسی پەیوەندی سیاسی نێو دەوڵەتەکانە کە لە جیاتی جەنگ‌و لە گەیشتن بە ئامانج لە رێگای وتووێژو کاری سیاسیانەو خۆ سازاندنەوە بگەنە ئەو ئامانجە • « لەسەر ئەم بنچینەو تێڕوانینە هەڵگیرساندنی شەڕ بە مانا شکستی دیپلۆمات ئەگرێتەوە • لەساڵی ۱۹۵۰ بە دواوە هەندێك لەو باوەڕەدان کە ئیتر هیچ دەوڵەت‌و گەلێك ناتوانن لە رێگای جەنگەوە بگەنە ئەو ئامانجانەی کە پێویستیانە •• بەڵام هەندێکی تر ئەڵێن جەنگی سنوردار وەکو هۆیەکی سیاسیانە بەکار ئەهێنرێت ••

### ● دیکتاتۆری پرۆلیتاریا Dictaturedu Proletariat

بریتی‌یە لە دەسەڵاتی چینی کرێکار، کە لە ئەنجامی لەناوبردنی ریژیمی سەرمایەداری‌و تێکشکاندنی چەرخەکانی دەوڵەتی بۆرجوازی دێتە کایەوە • دیکتاتۆری پرۆلیتاریا ناوەڕۆکی بنچینەیی شۆرشی

سوشیالیستانەو مەرجی گەورەی ئەنجامی ئەو شۆرشەو سەرکەوتنەکانێتی •
گەورەترین بنچینەی تیوری شۆرشگێرانەیـە • پرۆلیتـاریا بۆ روبـەرو
بونەوەی داگیرکاران‌و گەرانەوەی دەسەلاتی بۆرجوازی‌و لەناو بردنـی
کۆنەپەرستی ، سود لە دەسەلاتی سیاسی خۆی وەر ئەگرێت •

ئەم دیکتاتۆری‌یە بە مانا کرداری زۆرەملی‌یانە نیە لـە دژی چینـە
دەسـەلاتدارەکان بەلـکو کردارێـکی عەمـەلیانەو بونیـات نەرانەیـە •
هۆیەکە بۆ راکێشان‌و رامکردنی کۆمەلانی خەلـکی زەحمەتکێش بۆ لای
چینی کرێـکارو یەك خستنیان لە قـەوارەی کۆمەلـگایەکـی تـازەدا •
گەورەترین هۆی بونیان هێنانی هەمە لایەنیانەی ژیانی کۆمەلە وەکو :
ئابوری‌و سیاسەت‌و فەرهەنگ ( کولتور )و شێوازی ژیـان‌و پـەروەردە
کردنی شۆرشگێرانەو بونیاتانی کۆمەلـگایەکی نوێ • کەرەسەی گشتی
بونیاتانی قەوارەی سوشیالیزمە •

دیکتاتوری پرۆلیتاریا ، ئەنجامی گەشە کردنی راپەرینی چینایەتیانەیە
لە کۆمەلـگای سەرمایەداری‌دا ، زەمینە بۆ جێ بەجێ کردنی فراوانترین
شێوازی دیموکراتی بە قازانجی زوربەی کۆمەلانی زەحمەتکێشی خەلك
لە دژی کەمایەتی‌یە داگیر کارەکان ئەرەخسێنێ • ئەوەش بزانین کـە
دیموکراتی ترین شێوەی کۆماری بۆرجـوازی جگـە لـە دەسـەلاتی
کەمایەتی‌یە زۆردارەکان بەسـەر زوربـەی خەلـکە زەحمەتکێشەکاندا
هیچی تر نیە •

بالاترین شێوەی بریتی‌یە لە یەکێتـی نێـوان چینـی کرێـکارو
جوتیارەکان بە رابەرایەتی چینی کرێـکار • پایـەی کۆمەلایەتـی ئـەم
دیکتاتۆری‌یە لە کۆمەلـگای سوشیالیستی‌دا فراوانترو مەحکەمتر ئەبێت •
ئەو هێزەی کە رابەری بنچینەیی سیستەمی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا ئەکات

پێشڕەوەکانی چینی کرێکارە • ئەمە نەك تەنیا لەگەڵ دیموکراتی سوشیالیستی دا ئەگونجێ بەڵکو زامنی پاراستنیشی ئەکات •• چونکە دیموکراتیەت خزمەتی خەڵك ئەکاتو قازانجی زوربەی خەڵك ئەپارێزێت کە ئەوانیش چینی زەحمەتکێشن • چونکە دیموکراتی تا ئەو کاتەی کە ناکۆکی چینایەتی هەبێت ئەویش وەك مەسەلەیەکی چینایەتی دیار ئەبێت •

لە بارەی مێژوییەوە یەکەمین شێوەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا کۆمونی پاریس بو لە ساڵی (١٨٧١) دا •• کە گەلێك تاقیکردنەوەی مێژوویی گرانبەهای بە بیروباوەڕی پێشکەوتووانە بەخشی ••

**دیواری چین :** China Wall

دیوارێکی زۆر گەورەو درێژە ، لە ماوەی چەندان سەدەدا بە ملیۆنەها کەس کاریان تیا کردوەو کەوتۆتە بەشی ژووروی وڵاتی چینەوە • بەشێکی زۆری ئەم دیوارە بە تایبەتی لە سەدەی سێیەمی پێش زاینیدا دروست کراوە • ئەم دیوارە لە پارێزگای « گانسو » تاکو دەریای زەرد درێژ بۆتەوە ، بە مەبەستی پاراستنی ناوچەکانی خوارووی وڵات دروست کراوە • نزیکەی چوار هەزار کیلومەتر درێژەو بەرزییەکەشی خۆی ئەدات لە (١٠) دە مەترەو ــ لە هەندێك شوێندا زیاتریش ــ حەوت مەتریش پانایەکەیەتی •• ئێستاکە بەشێکی زۆری ئەو دیوارە وێران بووە ، بەهۆی ئەو دیوارەوە بەشێکی زۆری وڵاتی چین ــ بە تایبەتی ناوچەکانی خوارووی ــ لە ناوچەی ژوورو جیا کراوەتەوە •

زاراوەی دیواری چین لە گفتوگۆی سیاسیانەوکۆمەڵایەتیانەدا بەمانا جیا کردنەوەی تەواوی شتێکە لە شتێکی تر •• یان جیا کردنەوەی

باس‌و ڕێبازێکە لە باس‌و ڕێبازێکی تر .. بۆ نمونە ، ئەگەر بڵێین : دیواری چین لە نێوان شۆڕشی بۆرجوازی دیموکراتی‌و شۆڕشی سوشیالیستی‌دا نیە ، واتە ئەم دوو مەسەلەیە لە یەکتر جیا نین . یان بڵێین ڕێژیم ناتوانێ لە نێوان چینی کرێکارو کۆمەلانی خەڵك دا دیواری چین دروست بکات ، واتە هەرگیز توانای ئەوەی نابێت پەیوەندی‌یە بنچینەییەکانی نێوان چینی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان لەناو ببات‌و جیاوازی بخاتە نێوانیانەوە .

## ● ڕیالیزم Realism

بەمانا واقیع پەرستی‌یە ، بەرامبەر بە ئایدیالیسم . یان بڵێین خەیاڵ پەرستی ، .. ریالیست بەو کەسە ئەڵێن کە باوەڕی بە ڕاستی بێت‌و لە کارو کرداریا ڕاست‌و واقیع بین بێت . هەندێك جار بەو کەسانە ئەوترێ کە ئەوەی پێ‌ی ئەسپێرن بە ئەنجامی بگەیەنێت . ریالیست هەوڵ ئەدات لەگەل واقیعی خەڵك‌و ناوچەو دەوروبەرو جیهاندا بڕوات‌و بگونجێت . ئایدیالیست هەوڵ ئەدات جیهان‌و هەمو چۆنێتی‌یەکان بخاتە ناو جۆغزی ئایدیالیستیانەی خۆیەوە .

## ● ریفراندۆم Referandum

ڕاوەرگرتنی ڕاستەو خۆی ئەندامانی ڕێکخراوێك یان کۆمەڵێکە بۆ دەنگدان لەسەر بابەتێکی سیاسی کە ڕابەران‌و نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن . یەکەمجار تەنیا بۆ دانانی یاسا ئەمجۆرە دەنگدانە ئەکرا ، لە ساڵی ١٨٣١ دا بۆ یەکەمین جار هەڵبژاردن کرا ، دوای ئەوە بۆ هەر کارێکی پێویست وەکو یاسادانان‌و ئەمجۆرە شتانە هەڵبژاردنی بۆ ئەکرا.لە

سالی‌کانی ۱۸۹۸ ـ ۱۹۵۷ له بیست‌و یه‌ك ناوچه‌ی ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مه‌ریکدا هه‌لبژاردنیان کردوه •

**یه‌کهم :** زۆره ملی‌یانه

**دووه‌م :** ئاره‌زوو خوازیانه

جۆری زۆره‌ملی‌یه‌که به زۆری بۆ دانانی یاسای بنچینه‌یی ولاته ، جۆره‌که‌ی تریان له‌سه‌ر ویست‌و داخوازی خه‌لکه ، له سالی ۱۹٤٦ ه‌وه تا ئیستا له فه‌ره‌نسه سێ جار بۆ گۆرینی یاسای بنچینه‌یی ولات هه‌لبژاردن کراوه • دوا هه‌لبژاردن له‌و ولاته له سالی ۱۹٦۱ دا له باره‌ی سه‌ربه‌خۆیی جه‌زایره‌وه بو •

● **رادیکالیسم** Radicalisme

رادیکال له زمانه‌وانیدا به مانا بنچینه‌یه ، یان ره‌گ‌و ریشه هاتووه ، رادیکالیسم به‌مه‌فهومی گشتی به‌ریبازی ئه‌و که‌سانه ئه‌وترێت که ئه‌یانه‌وێ هه‌مو کاروبارێك به‌ته‌واوه‌تی بکرێ‌و بنچینه‌یی بێت • رادیکالیسمی بۆرجوازیش هه‌یه به ریبازێکی سیاسی ئه‌وترێ که چاره‌سه‌ر کردنی دیموکراتیانه له چوار چێوه‌ی به‌رنامه‌ی سه‌رمایه‌داری‌دا دیاری بکات‌و له واقیع دا قازانجی توێژه‌کانی ورده بۆرجوازی بپارێزێت •

دیسانه‌وه به مه‌فهومی گشتی زاراوه‌ی رادیکال به‌مجۆره به‌کار ئه‌هێنرێت وه‌کو [ ئێمه ئه‌مانه‌وێ گۆرینێکی رادیکالی‌یانه بکرێ ] •• وه یان [ فلان مه‌سه‌له پێویستی به گۆرینی رادیکالی یانه هه‌یه ] •• واته ئێمه ئه‌مانه‌وێ گۆرینێکی بنچینه‌یانه بکرێ ، وه یان فلان مه‌سه‌له پێویستی به گۆرینی بنچینه‌یی یان ریشه‌یی هه‌یه •

## ● راسیسم Racisme

راسیسم یان رەگەز پەرستی لە وشەی « راس » کە بە مانا « رەگەز » ئەگرێتەوە وەرگیراوە • راسیسم تیوری‌یەکی دژی زانستی‌و کۆنەپەرستانەیە ، کە لە ناو رەگەزە جۆربەجۆرەکانا لە رووی ژمارەو دەسەلاتی فیکری‌یەوە نابەرابەری‌یان ئەوێت • گوایا سروشت لە سەرەتاوە ئەم رەگەزانەی نا یەکسان ، واتە یەکێك بەرزو یەکێك نزمی دروستکردووە •

رەگەز پەرستەکان بە پێی ئەم تیوری‌یە بە تەواوی کۆنەپەرست‌و دژی مرۆڤن‌و بەربەرەکانێی یەکسانی بونی ئادەمیزاد ئەکەن • لە کاتێکدا زانست‌و تاقیکردنەوە ئەوەی سەلماندووە کە جیاوازی نێوان رەگەزەکان شتێکی روکەشەو لە روی گەشە کردن‌و ئامادەبون‌و توانای فیکری‌و مەعنەوی‌و چالاکی کۆمەلایەتی‌و زانستی‌یەوە هیچ ئەهمیەتێکی نیە •

کۆنەپەرستی لە ولاتە سەرمایەداری‌یەکانا پشت بە تیوری رەگەز پەرستی‌و سیاسەتی دژی مرۆڤ ئەبەستێ‌و پالەپەستۆیەکی زۆر ئەخاتە سەر کەمە نەتەوایەتی‌یەکان‌و رەگەزە بچوکە ژێر دەستەکان ، هەمو مافێکیان زەوت ئەکەن‌و کاری زۆر نارەوایان بەرامبەر ئەکرێ ، ئەو کردارە نامرۆڤانەیەی کە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دژی رەش پێستەکان‌و سور پێستەبوومی‌یەکان ئەکرێ ، یان لە رۆدیسیاو ئەفەریقای خوارو لە دژی رەش پێستەکان ئەکرێ هەموی ئاشکرایە •

لەگەل ئەوەشدا نوسراوەی مافی ئادەمیزاد چەندە سەرزەنشتی جیاوازی رەگەزایەتی ئەکات‌و تیوری « راسیسم » لە جیهانی سەرمایەداری‌دا رەت ئەکاتەوەو بە تیوری‌یەکی کۆنەپەرستانەی دژ بە خەلکی دا ئەنێت •

زانستی مرۆڤ شوناسی‌و خەڵك شوناسی‌و مێژوو ، هەروەها تاقیکردنەوەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کە ستەمی نەتەوایەتی‌یان تیا لەناو چووە بە پێی ئەو نموونانەی کە رەگەزە جۆربەجۆرەکان لە زەمینەی زانستی ، هونەری ، ئەدەبی ، کۆمەڵایەتی ،... خۆ رێکخستنەوە چالاکی‌یان هەیە ، تۆماری تیوری رەگەز پەرستی درۆزنانەیان دڕیوە . شارستانێتی ، پێشکەوتن ، زانست ، تەکنیك ، فەرهەنگ .. ئەمانە میراتی تایبەتی رەگەزێك نین . دوا کەوتن لە هەر شوێن‌و ناوچەیەکدا بێت جەمسەرەکەی بەستراوە بە ستەم‌و داگیرکارانەوە .

● **ریفۆرم** Reforme

ریفورم بە مانا کاری چارەسەریانەیە ، کە بۆ گۆڕینی هەندێك روکاری ژیانی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی ئەکرێ ، بێ ئەوەی کە گۆڕینێکی بنەڕەتی تەواو لە کۆمەڵدا دروست بکات . وەکو ریفورمی زەوی وزار ، ریفۆرمی ئیداری ، ریفۆرمی فێر کردن ، ریفۆرمی بازرگانی ، ریفۆرمی هەڵبژاردن و ...

ریفۆرم ، ئەو جۆرە گۆڕانەیە کە لە ناو چوار چێوەی رێژیمی کۆمەڵایەتی تێ ناپەڕێت‌و تواناى هێزە سیاسی‌یەکان تا رادەیەك نیشان ئەدات .. ریفۆرم لە هەر کات‌و زەمینەیەکدا بکرێ بەرهەمی خەباتی کۆمەڵانی خەڵکە ، بەڵام چینی دەسەڵاتدار هەوڵ ئەدات لە رێگای ریفۆرمەوە بەرگیری لە هێرشی کۆمەڵانی خەڵك بە تایبەتی چینی کرێکار بکات . بۆ ئەوەی زیان لە دەسەڵاتی خۆی نەکەوێت.. بە مەش مەبەستی هەرە گەورەی ئەوەیە بەرگیری لە گۆڕینی بنەڕەتی کۆمەڵ بکات . دیسان هەوڵی ئەوەش ئەدات ئەوەی کە بە زۆر لێی وەرگیراوە بەرە بەرە لە کۆمەڵانی خەڵکی وەر بگرێتەوەو بیانباتەوە دۆخی رابوردو .

**تیوری زانێك لەم ڕەوەوە وتویە :**

« مەفهومی ریفۆرم لەگەل مەفهومی شۆرشدا لە یەكتـر جیان ، ئەگەر ئەمە فەرامۆش بكەین و هەست بە هێلـی نێوان ئەم دوو مەفهومە نەكەین ئەوا ئەكەوینە هەلـەی گەورەوە .. بەلام ئەم سنورەی نێوان ئەم دوو مەفهومە شتێـكی وەستاو نیە ، بەلـكو هەمیشە لە گۆڕاندایە .. وە لە هەمو كات و سەردەمێـكدا پێویستە ئەو هێلە دیاری بكرێ » .

تیوری شۆرشگێرانە بەرهەلستی ریفۆرم ناوەستێ ، ئەو ریفۆرم و كارە چارەسەریانە رەت ناكـاتەوە كە لە جیهانی سەرمایەداری دا ئەكرێت .. وە هەروەها ریفۆرم بە لقێك لە لقەكانی شۆرش دائەنێت . شۆرشی كۆمەلانی خەلك هەندێـك كات كە سەركەوتوو نابێت دەزگای دەسەلاتدار ناچـار ئەكات پەنا بەرێتە بەر یاسای ریفۆرم . پێویستـە رێـكخراوە شۆرشگێرەكان دەسەلاتی فەرمانرەوا بە جۆرێـك ناچار بكـەن كـە زۆر تـرو قولتـــر ریفۆرمەكان جێبەجێ بكات . هەروەكو تیوری زانیك وتویە :

**« پێویستە بۆ فراوانبوونی زەمینەی ڕاپەڕینی چینایەتی سوود لە ریفۆرمەكان وەربگیرێت » .**

ئەگەر لە ریزەكانی ڕاپەڕینی كۆمەلانی خەلـكدا كەسێـك بە یاسای ریفۆرمەكان قایل بێت پێی ئەلێن « ریفۆرمیست » . ریفۆرمیسم زاراوەیەكە لەناو ڕاپەڕینی سیاسی كۆمەلانی خەلـكدا دوژمنی هەرە گەورەی قازانجی چینـی زەحمـەتكێشە . ریفۆرمیست ڕاپەڕینی چینـایەتی و شۆرش رەت ئەكاتەوەو لایەنگری ئەو ریفۆرمانە ئەكات كە زیان بە بونیادی سەرمایەداری ناگەیەنێت .. كەوابو ریفۆرمیسم مانای خۆ بەدەستەوەدان ئەگرێتەوە .

**ریفۆرمی زەوی‌و زار :**

ریفۆرمی زەوی‌و زار یان چارەسەر کردنی زەوی‌و زار بریتی‌یە لە کۆمەلە کردارێک کە دەولەت لە بارەی گۆرینی جۆری ملکداریتی زەوی‌وزارو شێوەی سود وەرگرتن لە زەوی ئەیکات •

لە ولاتە سەرمایەداری‌یەکانا مەبەست لە ریفۆرمی زەوی‌وزار ئەوەیە زەمینەیەکی لەبار بۆ گەشە کردنی پەیوەندی‌یەکانی سەرمایەداری لە لادێکانا برەخسێ‌و راپەرینی جوتیاران لاواز بکات‌و بەرگیری لە هەر جۆرە راپەرینیکیان بکات • بەمجۆرە ریفۆرمە سەرمایەدارە خاوەن سنعەتەکان‌و خاوەن بانقەکان‌و پیاوە دەولەتی‌یە گەورەکان‌و سپایی‌یە دەسەلاتدارە گەورەکان‌و زوربەی دەولەمەندەکانی تر ئەتوانن جێگای خۆیان مەحکەمتر بکەن‌و شێوەی دەست بە سەراگرتنی سەرمایەداری‌یانە کە جێگری دەست بە سەراگرتنی سەردەمی پێش خۆیەتی زیاتر بچەسپینن • ئەمجۆرە ریفۆرمە ئەگەرچی لە روی ئابوری‌یەوە ئەتوانێ سود لە زانستی تەکنیك‌و مەکانیزە کردنی زەوی‌و زار وەر بگرێ ، بەروبومی کشتوکالی زیاتر بکات •• بەلام لە روی باری کۆمەلایەتی‌یەوە زوربەی جوتیارەکان مالوێران ئەکات‌و ناکۆکی گەورەتر دێنێتە کایەوە ، چونکە ناتوانێ بە شێوەیەکی رادیکالی‌یانە مەسەلەی زەوی‌و زار بن بڕ بکات •

سیستەمی سوشیالیستی هەمو جۆرە چەوساندنەوەیەك لە لادێکانا لەناو ئەبات‌و زەوی‌و زاربۆهەمو جوتیارەکان دابین ئەکات ، هێزی کاری جوتیارەکان لە سەر ئارەزووی خۆیان لە کێلگە هەرەوەزی‌یەکانا کۆ ئەکاتەوە •• تەکنیکی هاو چەرخیان ئەخاتە ژێر دەسەلاتەوە • یارمەتی مادی‌و رێکخستنیان ئەدات‌و هۆیەکانی پێشکەوتنی ئابوری کشتوکالی‌یان

بۆ دابین ئەکات‌و بەمجۆرە باری گوزەرانیان ئەگۆڕێ‌و بەرەو پێشـــتر نەچێت •

## ● ریڤیژیۆنیزم Revisionisme

بەو کەسانە ئەڵێن سەرنجی تازە ئەدەن ، بریتی‌یە لەو ڕێبازە لە ناو ڕاپەڕینی کرێـکاراندا بە بێ هیچ جۆرە پاڵپشتێـکی ڕۆشنبیرانە سەرنجی تازە لە بنچینەکانی تیوری شۆرشگێڕانە ئەدەن‌و ڕەتی ئەکەنـەوەو لـــە ڕێـگای لا ئەدەن ، ناوەڕۆکی شۆرشگێڕانەو هـەمو ئامۆژگـــاری‌یەکانی ئەدەنە دواوەو لە ناوی ئەبەن • بـە واتایـەکی تر ریڤیژیۆنیـــزم واتـە سەرنجـدانی تازە لـە هەندێـک بنچینەو شێوازەکانی •••• بێ ئـەوەی پاڵپشتێـکی ڕۆشنبیرانەیان لەم بارەیەوە هەبێت • ریڤیژیۆنیـزم کرێـکار لە چەکی تیوری سیاسیانە بێ بەش ئەکات • بەمکارەش خزمەتێـکی زۆر گەورە بە ڕێژیمی‌سەرمایەداری ئەکات • روشنبیری پرۆلیتاریاو سوشیالیزمی زانستی ، زانستی‌یەکی بونیات‌نەرانەیە •• دوگماتیزمی نیە ، زانستی‌یەکە لەگەل پێـگەیشتنی ژیان‌و گەشە کردنی کۆمەڵ‌و پەیـدا بوونـی دیاردەی تازەدا بەهێز تر ئەبێت‌و باشتر پێ ئەگات •

لە رووی مێژووەوە لە دوا دەیەی سەدەی رابوردودا ریڤیژیۆنیزم پەیدا بووە ، کە لەو کاتەدا یەکێك لە سوشیال دیموکراتەکانی ئەڵەمان کە ناوی برنشتاین بو بە ئاشکرا دەســتی کـــرد بە رەتکردنـــەوەی یاســا بنچینەییەکانی تیوری شۆرشگێڕانەو دانانی تیـوری تر لـە جێـگای •• شێوەیەکی تر لە ریڤیژیۆنیزم ئەو هەوڵدانەی کاوتسکی بو کە یەکێك بوو لە رابەرە دەرکەوتووەکانی هەمان سوشیال دیموکراتی ئەڵەمان •

ریڤیژیۆنیستەکان ئەڵێن ئامۆژگاری‌و یاساکانی تیوری زانستی کۆن

بووه ، بەم پێیە بەهاو ماهیەتی لە بواری گۆڕانی کۆمەڵو بونیاتنانی تازەی کۆمەڵو سەقامگیر بونی سوشیالیزم دور ئەخەنەوە .

لە بەر باری سەرنجی فەلسەفیانەدا ریڤیژیۆنیزم سەرنجی تازە لە شێوازەکانی دیالەکتیکی ماتەریالیستی ئەدات‌و ئایدیالیزم لە جێگای دائەنێت . ریڤیژیۆنیزم بەلای چەپو لای راستدا لە شێوازی شۆرشگێڕانە بە دورەو خۆی لێ لا ئەدات . ریڤیژیۆنیزمی راست لە پێناوی قازانجی راستەو خۆی بۆرجوازیو ئاشبەتاڵی شۆرشی کۆمەلایەتیو کڕنوشو خۆ بە دەستەوە دان و شێوازی ئەپۆرتونیزمانەو ریفۆرمیزمانەدا کار ئەکات . ریڤیژیۆنیزمی چەپیش واتا سەرنجدانی تازە لە شێوازو یاسای شۆرشگێڕی ئەدات‌و بە قازانجی چینی دەسەلاتدارو بۆرجوازی کار ئەکات .

## ● زایۆنیزم Scionisme

رێبازێکی ناسیۆنالیستی کوێرانەی بۆرجوازی جولەکەیە ، لە کۆتایی سەدەی رابوردوودا لە ئەوروپا سەری هەڵدا ، ئیستاش بووە بە ئایدیۆلۆجی رەسمی دەوڵەتی دەست درێژکاری ئیسرائیل . ئەم ناوە لە وشەی « سەهیون »ەوە هاتووە کە ناوی ناوچەیەکە لە نزیک « ئورشەلیم »و جولەکەکان بەلایانەوە شوێنێکی پیرۆزەو خۆشیان ئەوێت .

لە ساڵی ١٨٩٧ دا رێکخراوی زایۆنی جیهانی پێک هات کە مەبەست‌و ئامانجی کۆچکردنی هەمو جولەکەکان بو بۆ فەلەستین .. ئێستا وزەی دارایی ئەم رێکخراوە بەرامبەر بە وزەی دارایی گەورە ترین کومپانی جیهانی یە . چەندان کومپانیای ئیسرائیلیو خاوەن زەویو زاری گەورەو دەزگاو دامەزراوی کشتوکاڵیو کارگەی بەرهەم هێنان ئەندامی ئەو رێکخراوەن .

مەڵبەندی ڕێـکخراوەکەیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایـەو سەرپەرشتی چالاکی لق‌و کۆمەڵە زایۆنی‌یەکانی زیاتر لە ٦٠ شەست وڵاتی جیهانی ئەکات • گەلێك ڕێـکخراوی لقی‌و کۆمیتەو یەکێتـــی فراوانیـان هەیە• پێویستە ئەوە بڵێین کە زایۆنیستەکان لە سەرەتاوە لە پێناوی پاراستنی قازانج‌و سات‌و سەودای دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان ئامادە بون بنکەی خۆیان لە ئەمەریکای لاتین یان کینیا یان ئۆگەندە یان لە ئەوروپـای ڕۆژهەڵاتـدا دابنێن •

بۆرجوازی جولەکە چەندان ساڵە دەستیان کردوە بە گەشە پێـکردنی هەستی ناسیۆنالیستی‌و نەتەوە پەرستی کوێر بینانەو لەژێر ئاڵای زایۆنیزمدا بـەو پەڕی توانایانەوە هەوڵیان داوە ئەم ڕێبازەیان لە پێناوی خزمەت بـە کۆنەپەرستان‌و ئیمپریالیزمدا گەشە پێ بدەن •

زایۆنیستەکان وا بیر ئەکەنەوە نەتەوەیەکی سەربەخۆی جولەکـە هەیەو پێویستە هەمو جولەکەکانی ئەم جیهانە لە خۆیا کـۆ بکاتـــەوە •• ئەمجۆرە بیر کردنەوەیە لە بەر باری سەرنجی سیاسیانەدا بیر کردنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیە • لەبەر باری سەرنجی زانستیانەشەوە دیسـان بـێ پایەو نامەنطقیانەیە •

زایۆنیزم جولەکە بە نەتەوەیەکی شاز ئەزانێ‌و وای دائەنێ کــە جولەکە دیاردەیەکی خواوەندیانەیەو نامەیەکی تایبەتیان هەیە • زایۆنیزم بەر لە هەمو شتێك لەگەل قازانجـی پرۆلیتاریـای جولەکـەدا ڕێـك ناکەوێت • زایۆنیزم چەندان ساڵە هەوڵی دروستکردنی دوبەرەکایەتی‌و ناکۆکی نانەوە ئەدات لە نێوان جولەکەی وڵاتەکـان‌و ئـەو خەڵـکانەی لەگەلیانا ئەژین‌و هەوڵ ئەدات هەمیشە ڕقە بەرایەتی‌و دوژمنایەتی لــە نێوانیاندا بخولقێنێ‌و بەهێزیان بکات •• ئینجا لەم ڕووەوە هیچ جیاوازی‌یەك

له نێوان زایۆنیزمو ئانتی سمیتیزمدا نیه • هەردوکیان زایۆنیزمو ئانتی سمیتیزم ، دژی جولەکە ، ڕێبازێکی کۆنەپەرستانەو ڕەگەز پەرستیو ئسیۆنالیستی کوێرانەو دوژمنی یەکێتی زەحمەتکێشانن •• هەمو تیوری‌یەکی شۆرشگێڕانە بە هەمو توانایەکەوە هەردوکیان ڕەت ئەکاتەوە •

زایۆنیزم ، تەنیا ئایدیۆلۆجی یەك نیە بەڵکو سیستەمێکی فرە پەیوەندی‌یانەو چەندان دەزگاو دامەزراوو کۆمەڵە تیوری‌و ڕێکخراوی جۆربەجۆرە •• هەروەها بریتی‌یە لە چەندان ڕێکخراوو سیاسەت‌و ڕەووشتی سیاسیانەو ئابوری بۆرجوازی‌یە گەورەکانی جولەکە ، کە لە گەل دەزگا ئابوری‌و کومپانیا گەورەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ولاتە ئیمپریالیستیەکانی ترا دەستیان تێکەڵ کردوەو پێکەوە جۆشیان خواردوە • ناوەڕۆکی بنچینەیی زایۆنیزم ، شۆڤینیزمی شەر خوازانەو دژی پێشکەوتنە •

زایۆنیزم ، لە ولاتە جۆر بە جۆرەکانی جیهاندا تێ ئەکۆشێت ، کرێکاران و زەحمەتکێشانی جولەکە لە بواری کارو ژیانو چالاکی دا لە کرێکارانو زەحمەتکێشانی جیهان دابڕ کات ، وە ڕێگایان نادات بەشداری ڕاپەڕینی کرێکارانەو دیموکراتیانە بکەن • زایۆنیزم بە هەڵگرتنی دروشمی هەڵەی خۆیان « یەکێتی قازانجی نەتەوەیی جولەکەکان » ئەیانەوێت ناکۆکی نێوان کرێکارانو سەرمایەداران ، بەرهەم هێنەرو چەوسێنەرەوە جولەکەکان بشارنەوە • قازانجی زەحمەتکێشە جولەکەکان بکەن بە قوربانی لە پێناوی قازانجی بۆرجوازی‌یە گەورەو دەوڵەمەندەکانی جولەکەدا •

ئیمپریالیزمی جیهانی سودێکی زۆر لەو پیلانە دژ بە نەتەوایەتیانەو

هەڵوێستی دژی ئازادیخوازانەو سوشیالیزمەی زایۆنیزمەکان وەرئەگرێ •
کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشی جولەکە بە پێی نەخشەی دوژمنانەو
دژی خەڵکی خۆیان هەل ئەخڵەتێنن •

خاڵی هاوتای زایۆنیزم ئانتی سمیتیزمە « ئانتی واتا دژ ، سمیت بە
مانا سامی »یە ـ ئەو رەگەزەیە جولەکان ئەچنەوە سەری ـ رەووشتێکی
دوژمنانەیە بەرامبەر بە جولەکـە ، هەمـو مەســـەلەیەکی چینایـەتیو
کۆمەڵایەتی ئەداتە لاوە •• ئانتی سمیتیزم لە هەمو لایەك وەکو چەکێکی
دوبەرەکی نانەوەو لادان لە واقیعو لادانی زەحمەتکێشەکان لەســـەر
رێبازی مەسەلە واقیعیو سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان بەکـار هێنـراوە •
ئەوەتا بە شێوەی نامرۆڤانەو کوشتاری دەستە جەمعیو ئاوارە کردنـــی
خەڵك گەشەی کردوە • ئانتی سمیتیزم هەروەکو زایۆنیزم تەنیا قازانجی
چینە چەوسێنەرەوەکانو هێزە کۆنە پەرستەکانی ئەوێتو ئەیان پارێزێت ،
کە لەم رێـگایەوە زیانێـکی زۆر بە راپەڕینی چینایەتیانەو یەکێتی کۆمەڵانی
خەڵـکی زەحمەتکێش ئەگەیەنێت •

**ژێرخانو ســەرخان :**

ژێرخان یان پایە •• بیری پێشکەوتوانە لە نێوان ئـــەو کۆمەڵـە
پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی کە لە هەر کۆمەڵـگایەکدا هەبن پەیوەندییە
مادیو بەرهـەم هێنەرەکـان وەکـو پەیوەنـدی بنچینەیـیو دیاریکـەر
ئەزانێت •• ژێرخان ، یان پایەی کۆمـەڵ بریتییـە لـە کۆمەڵێـك لـەم
پەیوەندییە بەرهەم هێنەرانە کە قەوارەی ئابوری کۆمەڵـــی لـێ پێـك
دێت • مەبەست لە کۆمەڵێـك پەیوەندی بەرهەم هێنان بریتییـــە لـــە
شێوەکانی مڵـکدارێتیو پەیوەندی نێوان خەڵـکەکان کـــە لەم شێـوەی

مڵکدارێتی‌یه دا ده‌وریان هه‌یه •• له‌گه‌ل شێوه‌کانی دابه‌شکردنی به‌روبوم دا •

هه‌مو کۆمه‌ڵێک پایه یان ژێرخانی هه‌یه ، ژێرخان وه‌کو کۆمه‌ڵێک په‌یوه‌ندی به‌رهه‌م هێنان به‌ستراوه به باری هێزه به‌رهه‌م هێنه‌ره‌کانه‌وه •

ژێرخان ، رۆڵێکی گه‌وره له ژیانی کۆمه‌ڵدا ئه‌گێڕێ ، ماوه بۆ ئه‌وه خۆش ئه‌کات که به‌رهه‌م هێنان‌و دابه‌شکردنی به‌روبومه مادی‌یه‌کان رێک بخرێت • هیچ که‌س به بێ سه‌قامگیربونی په‌یوه‌ندی‌یه به‌رهه‌م هێنه‌ره‌کان ناتوانێت ده‌ست به کاری به‌رهه‌م هێنه‌رانه بکات‌و له ئه‌نجامدا پێداویستی‌یه‌کانی ژیان دابه‌ش بکات • گۆڕینی هه‌ر سه‌رده‌مێکی کۆمه‌ڵایه‌تی به سه‌رده‌مێکی تر یان بڵێین هه‌ر قۆناغێك به قۆناغێکی تر واته گۆڕینی پایه به مانا ژێرخانه • واته هێنانه کایه‌ی په‌یوه‌ندی به‌رهه‌م هێنانی تازه •

**سه‌رخان :**

که روبیناشی بێ ئه‌ڵێن ، بریتی‌یه له تیوری سیاسی ، ماف ، فه‌لسه‌فی ، ئه‌خلاقی ، هونه‌ری ، مه‌زهه‌بی کۆمه‌ڵ‌و ئه‌و ده‌زگاو دامه‌زراوانه‌ی پێیه‌وه په‌یوه‌ندیدارن ، له‌گه‌ل شێوه‌کانی هۆشیاری کۆمه‌ڵایه‌تی • ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ژێرخان به ریشه یان ئیسقانی له‌شێک دابنێین ، ئه‌و کاته ئه‌توانین سه‌رخان به‌لق‌و گه‌ڵاو یان گۆشت‌و پێستی روخساری کۆمه‌ڵ دابنێین •

ئاشکرایه ئه‌م لێکچواندنه ساده‌یه ئه‌و په‌یوه‌ندی‌یه دیاله‌کتیکی‌یه قوڵه که سه‌رخان‌و ژێرخانی پێکه‌وه جۆش داوه به باشی نیشانی ئه‌دات • هه‌ر فرماسیۆنێکی کۆمه‌ڵایه‌تی - ئابوری ژێر خانی تایبه‌تی خۆیان

هەیە ، سەرخان لەسەر بنچینەی ئەم کۆمەڵە پەیوەندی یە ئابوریانە دامەزراوە کە لە شێوەی مڵکدارێتی دا پەیدا بووە • سەرخان لە بواری گەشە کردنی کۆمەڵدا رۆڵێکی دیار ئەگێرێ ، جگە لەوەی کە لە سەر بنچینەی ژێر خانی ئابوری دامەزراوە •• سەرخان بەهۆی ژێرخانەوە کارێکی کاریگەرانە ئەکاتە سەر گەشە کردنی هێزە بەرهەم هێنەرەکان •

● **سزاریسم-تزاریسم** Czarisme, Tsarisme

سزار ، یان تزار ، نازناوی ئیمپەراتۆری لەناو چووی روسیا بو لە ساڵی ١٥٤٧ – ١٩١٨ واتە تاکو دوا قەیسەری وڵاتی روس ئەم نازناوە هەبووە • هەر وەها بە پادشای بڵگاریاشیان وتووە لە ساڵەکانی ١٩٠٨ – ١٩٤٥ ، ئەم زاراوەیە بە مانا رژێیمی حکومەتی قەیسەری ئەگرێتەوە لە هەمان کاتا بە دەسەڵاتی زۆرداری و ئوتوکراسیش وتراوە • ئەم زاراوەیە بە تایبەتی لە دوای کۆتایی یەکەمین شەڕی جیهانی یەوە لەناو نوسینی نوسەرە گەورە جیهانی یەکانا هاتوەو باسی لێوە کراوە •

● **سوشیالیزم** Socialisme

یەکەمین قوناغی سەردەمێکی کۆمەڵایەتی – ئابوری یە ، کومەڵگایەکە بە پێی یاسا مادی یەکان گەشە کردنی کۆمەڵ لە جێگای سیستەمی سەرمایەداری جێگیر ئەکات ••

لە سەردەمی سەرمایەداری دا ئابوری وڵات لەسەر بنچینەی مڵکدارێتی تایبەتی و خاوەندارێتی هۆیەکانی بەرهەم هێنان ئەڕوات ، بەڵام لە سوشیالیزمدا بە پێچەوانەوەیە ، ئابوری وڵات لەسەر بنچینەی مڵکدارێتی دەستە کۆمەڵی هۆیەکانی بەرهەم هێنان دائەمەزرێت • واتا لە کۆمەڵگای سوشیالیستی دا لە جیاتی تاقمێك دەوڵەمەندی خاوەن

سەرمایەو خاوەن دەزگاو کارخانەکانو خاوەن هۆیەکانی گواستنەوەو ...
زەحمەتکێشەکان ئەبنە خاوەنی ئەمجۆرە شتانە .

لە کۆمەڵگای سوشیالیستیدا ـ کە تا ئیستا پێگەیشتووە ـ ئەتوانین
دو جۆر ملکداریتی دەستەکۆمەڵی دەست نیشان بکەین :

**یەکەم :**

ملکداریتی سەرتاسەری خەڵك یان دەوڵەت .

**دووەم :**

ملکداریتی دەستەکۆمەڵ یان هەرەوەزیانە یان کیۆپراتیۆیی . لە
هەریەك لەم دو جۆرە ملکداریتییە پەیوەندی تازەی بەرهەم هێنان کە
دەستی هاریکارییانەو هەرەوەزیانەیە بەریوەیان ئەبات .

پێویستە ئەوە رون بکرێتەوە کە لێرەدا باسی ملکداریتی هۆیەکانی
بەرهەم هێنان ئەکەین .. ئەگەرنا لە کۆمەڵگای سوشیالیستیدا
ملکداریتی تاکە کەسی لە هەندێك هەلو مەرجی تایبەتیدا ، تەنانەت
ملکداریتی هۆیە بچوکەکانی بەرهەم هێنان بە مەرجێك ئەگەر نەبێتە
هۆی چەوساندنەوەی خەڵك وەکو خۆی ئەمێنێتەوە .

لە دوای سەردەمێکی دورو درێژی کۆیلەیێتیو فیودالی
« دەرەبەگایەتی »و سەرمایەداری کە لەسەر پایەی چەوساندنەوەی خەڵك
دامەزرا بون ، سەردەمی سوشیالیزم چەوساندنەوەی خەڵکی لەلایەن
خەڵکەوە لەناو بردو هەرکەس توانی لە سنوری یاسای سوشیالیزمدا
بژیو ببێتە خاوەنی بەرهەمی خۆی . لەبەر ئەمەیە گۆڕینی سیستەمی
سەرمایەداری بە سیستەمی سوشیالیزم بەرزترین پلەو گەورە ترین خولی
مێژووی گۆڕینی کۆمەڵو پێگەیشتنی کۆمەڵگای ئادەمیزادە .

ئەم گۆڕینەش لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆرشی سوشیالیستیانە روو ئەدات •• گۆڕین لە سیستەمی سەرمایەداری‌یەوە بۆ سوشیالیزم کارێکی ئاسان‌و سەرپێ‌یی نیە • بەڵکو پڕە لە رووداوی گران‌و ئەرکی قورس • لە سیستەمی سوشیالیزمدا ئابوری تازە دائەمەزرێت ، فەرهەنگی نوێ دێتە کایەوە ، ژێرخانی کۆمەڵ لە بنەڕەتەوە ئەگۆڕدرێت • لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا هیچ ناوو نیشانێکی چەوساندنەوە لە ئارادا نامێنێت • لە سوشیالیستی دا چەوساندنەوەی نەتەوایەتی‌و چینایەتی‌و رەگەزایەتی لە ئارادا نامێنێت ، ئازادی‌و یەکسانی هەمو خەڵك دابین ئەکرێ •• تا ئەو کاتەی هۆیەکانی بەرهەم هێنان بەدەست کۆمەڵێکی تایبەتیەوە بمێنێتەوە ئازادی تاکە کەس‌و کۆمەڵ لە ئارادا نابێت • تا ئەو کاتەی زەحمەتکێشان بە ناچاری هێزی بازووی خۆیان بفرۆشن ئازادی هەر قسەی سەرزارەکی ئەبێت •

لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان کە پەیوەندی‌یەکی دەستە کۆمەڵیانەیە لەگەل خاسیەتی هێزە بەرهەم هێنەرەکانا کە ئەویش دەستە کۆمەڵی‌یە وەکو یەکن واتە هاو شانن •• ئەم هاوشانی‌یە ئەبێتە هۆی هەرە بنچینەیی بە خێرایی گەشە کردن‌و بەردەوامی ئابوری • ژیانی ئابوری کۆمەڵگای سوشیالیستی بە هۆی بەرنامەیەکی هەمەلایەنیانەوە گەشە ئەکات‌و پێ ئەگات •

لە روی کۆمەلایەتیەوە ، لە ئەنجامی لەناو چونی چینە چەوسێنەرەوەکان ، کۆمەڵگای سۆشیالیستی لە چینە دۆستەکان ، واتە چینی کرێکارو جوتیارو توێژە کۆمەلایەتی‌یە رۆشنبیرەکان پێك دێت •• هەرچەند ئەو کۆمەڵگایە زیاتر پێش بکەوێت جیاوازی‌یە بنچینەیەکانی نێوان کاری دەستی‌و کاری فیکری ، نێوان شارو لادێ زۆرتر لەناو

ئەچن .. لە قۆناغی دووەمی ئەم کۆمەڵگایەدا ، ئەم جیاوازی‌یانە بە تەواوی لەناو ئەچن .

کارکردن لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا بنچینەی بەهرەداری‌و سود وەرگرتنە لە کۆمەڵ ، وە هەر کەس بە پێی کارو توانای کاری بەشی خۆی وەر ئەگرێت . سوشیالیزم لە جیاتی بنچینەکانی سەرمایە بنچینەی کار دائەمەزرێنێت .

گۆڕین لە جیهانی سەرمایەداری‌یەوە بۆ سوشیالیزم لە وڵاتە جۆربەجۆرەکانا ، هەر وڵاتە بە پێی بارو دۆخی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی خۆی روخسارێکی هەیەو لە هەل‌و مەرجی جۆربەجۆری مێژوییدا بە شێوەی هەمە چەشنە بە ئەنجام ئەگات .

سوشیالیزم ، ئاسۆی رزگاربون لە ئیمپریالیزمی نیشان خەڵك داوە ، رێژیمی کۆمەڵایەتی تازە بە پشتیوانی مڵکداریتی دەستە کۆمەڵی‌و بە خاوەن بونی هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و دەسەڵاتداریتی زەحمەتکێشانەوە ئەتوانێت بەرنامەیەکی ئابوری بێ ئاڵۆزی بە قازانجی تەواوی خەڵك دابمەزرێنێت . مافی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی زەحمەتکێشان مسۆگەر بکات . ئەوە سەلمێندراوە کە تەنیا سوشیالیزم ئەتوانێ هەمو مەسەلە بنچینەیەکان‌و گیروگرفتە سەرەکی‌یەکانی ژیانی ئادەمیزاد چارەسەر بکات ..

سوشیالیزم لە وشەی Social ی فەرەنسەیەوە وەرگیراوە کە بەمانا « دەستە کۆمەڵی » ئەگرێتەوە . ئەم زاراوەیە لە گەلێك فەرهەنگدا بەدی ئەکرێ ، بە تایبەتی لە فەرهەنگی ئاکسفوردی ئینگلیزی‌دا ئەویش ئەم مانایە ئەگرێتەوە .. سوشیالیزم ، تیوری یان سیاسەتێکە کە ئەیەوێ مڵکداریتی دەستە کۆمەڵی پەیدا بێت‌و کۆمەڵ ببێتە خاوەنی هۆیەکانی

بەرهەم هێنان • سەرمایەو زەوی‌و زارو کەل‌وپەل‌و هەمو شتێـکی تـر بێتە ملـکی تایبەتی کۆمەڵ‌و بەقازانجی کۆمەڵ کاریان پێ بکرێ ••

سوشیالیزم لەبەر باری ســـەرنجی مێژوویـیـدا راپەڕینێـکە دژی ئەندیڤیدوالیزم‌و لیبرالیزم •• سوشیالیزم بەرهەمی شۆرشی پیشەسازی‌یە چونکە شۆرشی پیشەسازی دو چینی تازەی گەورەی وەکو سەرمایەداران‌و کرێـکاران لە کۆمەڵدا ئەخولقێنێ •• هەروەها ئایدیۆلۆجی تایبەتی چینی کرێـکاریش سۆشالیزم دێنێتە کایـەوە • کەوابـــو ســـۆشیالیزم ئەو ئایدیۆلۆجی‌یەیە کە لە ئەنجامی شۆرشی پیشـەســـازی‌و بە قازانجـــی پرۆلیتاریا ئەبێت •

زاراوەی سۆشیالیست یەکەمجار لە ساڵی **١٨٢٧** دا بە لایەنگرانـی « رابرت ئاون »یان ئەووت ، وە سۆشیالیزم لە ساڵی **١٨٣٢** لە بڵاو کراوەی ئۆرگانی لایەنگرانی « سان سیمون »دا بە مانای بیروباوەڕی سان سیمون وتراوە • دوای ئەوەش لـە فەرەنسەو بەریتانیـاو ئەڵەمـان‌و ئەمەریـکادا ئەم زاراوەیە بە زۆری لە چاپەمەنیەکانا بڵاو ئەکرایەوە ••

یەکـەمین دەستەی سوشیالیست ئـەو کەسانە بون کـە باوەڕیان بە سیستەمی کۆمەڵایەتی هەبو ، هەمویان لەسەر یەك خـاڵی سەرەکی رێك کەوتبوون ئەویش دوژمنایەتی کردنی ئەندیڤیدۆئالیستی بو ••

## ● **سانسۆر** Censeur

لە زمانی لاتینی‌دا بە مانا دەست خستنە ناو کاروبارەوە هاتوە ، قەدەغە کردن بە هۆی دەسەڵاتەوە سیاسی بێت یان ئاینی یان هـــەر جۆرێـکی تر •• سانسۆر لە بواری سیاسی‌و تیوکراتیکدا ئەکرێ ، بەڵام ئیستا بـە زۆری لە بواری چاپەمەنیدا ئەکرێ ، لە سەدەی شـازدەیەمـی زاینی‌دا

کلیسای کاتولیك یەکەمین نمونەی نوسراوە قەدەغە کراوەکانی بڵاو کردەوە ، پرۆتستانتەکان لە بواری چارە سەر کردنی ئاینیاتەدا سودیان لە سانسۆر وەر ئەگرت •

**سانسۆر لە رۆژ گاری ئیستای ئێمەدا بە دو جۆر کاری پێ ئەکرێ :**

**یەکەم :**
سانسۆری **قەدەغەکردن** •

**دووەم :**
سانسۆری سزا دان •

جیاوازی نێوان ئەم دو شێوازە ئەوەیە ، یەکەمیان بەر لە بڵاو بونەوەیەو دوەمیان دوای بڵاو بونەوەوە • هەندێك جاریش لەسەر رێکەوتنی نێوان نووسەرەکان ئەبێت کەهەموویان رێك ئەکەوون لەسەر بابەتێك کە بڵاو نەکرێتەوە ، ئەویش لەبەر ئەوەیە نەوەك زیان بە ئاسایشی وڵات بگەیەنێت •

لە کۆمەڵگای دیموکراتیانەدا سانسۆر هێنانەو بۆ قازانجی خەڵکە ، تەنیا لە کاتی شەرو ئاژاوەدا توندو تیژ ئەبێت •

● **سانترالیسمی دیموکراتی** Centralisme Democratique

لە روی زمانەوە ئەم زاراوەیە لە دو وشە پێك هاتووە ، سانترالیسم واتە ناوەندێتی « مەرکەزیەت » ، دیموکراتیك سیفەتی وشەی دیموکراتی‌یە • • هەندێك جاریش پێی ئەوترێ [ مەرکەزیەتی دیموکراتی ] •• سانترالیسمی دیموکراتیك رابەرایەتی دەستە کۆمەڵی‌یە لەناو رێکخستنی رێکخراوە تازەکاندا ، سانترالیسمی دیموکراتی

پەیوەندی نێوان رابەرایەتی‌و ئەندامانی رێـکخراوەکە ، نێوان ئۆرگانەکانی سەرەوەو خوارەوە ، نێوان ئەندامانی رێـکخراو ، لە خۆیا دەر ئەخات ..

مەفهوومی سانترالیسم بریتی‌یە لـە یێك هێنانی رێکخراوەکانی هەر حزبێـك لە رێـگای هەڵبژاردنەوە .. دیموکراتـی و مەرکەزیـەت دو رووی یەك شتن ، لە ژیانی ناو خۆی رێـکخراودا .. لە زۆر رێـکخراوی ناکرێـکاری‌دا لەم بارەیەوە قسـە کراوە . بـەڵام هیـچ رێـکخراوێـکی بۆرجوازی یان دەرباری سەرنجی ئەم مەسـەلەیە نادەن‌و رەفتـاری پـێ ناکەن . رێـکخراوێـکی کرێـکاری ، رێـکخراوێـکی شێواز تازە کـە لە سەر بنچینەی تیوری‌یەکی شۆرشگێرانە بڕوات هەرگیز ناتوانێ دور لەم رێبازە چالاکی‌یەکانی خۆی یەك بخات .. رێـکخراوی چینـی کرێـکار ئۆرگانیسمێـکی گەشە کردوە وەکو هەر دیاردەیەکی تر ، لـە ئەنجامـی ناکۆکی‌یەکانی ناو خۆیدا گەشە ئەکات .. رێـکخراو لەسەر بنچینـەی ناکۆکی‌یە دەروونی‌یەکانی خـۆی گەشـە ئەکـات . گۆڕینـی هـەر رێـکخراوێك بە بێ ناکۆکی ناوخۆ گۆڕانێـکی نا دیالەکتیکی یانەیەو لـە جیهانی واقیع بە دورە .

**سانترالیسم ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەگرێتەوە :**

١ ـ ئەو رێـکخراوە بەرنامەیەکی یەکگرتووی هەبێت

٢ ـ ئۆرگانێـکی باڵا رابەری بکات کە پێی ئەڵێـن « کۆمیتەی ناوەندی »و ئەویش لە کۆنگرەیەکەوە بۆ کۆنگرەیەکی تر هەڵبژێردرابێت .

٣ ـ هەمو ئۆرگانەکانی رێـکخراوەکە سەر بە ناوەنـد « مەرکەز » بن ، ئۆرگانەکانی خوارەوە سەر بـە

ئۆرگانەکانی سەرەوە بن و کەمایەتی سەر بە زۆرایەتی بێت •

٤ ـ رێکخستنێکی هۆشیارانە دەسەڵاتدار بێت تیایا ، کە شێوازێکی نوێ بۆ هەمو ئەندامان وەکو یەك دیاری بکات •

**دیموکراسیش ئەم خاڵانە ئەگرێتەوە :**

١ ـ هەمو ئۆرگانەکان لەسەرەوە تا خوارەوە بە پێی هەڵبژاردن بێت •

٢ ـ هەر ئۆرگانێکی رابەری ئەرکی راپۆرت دانی لەسەر ئەو ئۆرگانەی لە ئەستۆدایە کە هەڵی بژاردوە •

٣ ـ شیکردنەوەو باسکردنی هەمو مەسەلە سیاسیی و رێکخستنیەکان بە پێی بڕیاری باڵا مافی هەمو ئەندامێك بێت •

● **سەرمایەداری** Capitalisme

سەرمایەداری ئەو قوناغە پێگەیشتووە کۆمەڵایەتی ـ ئابوری یەیە کە جێگای سیستەمی کۆمەڵایەتی فیودالی گرتۆتەوە •• سەرمایەداری دوا ریژیمێکە کە لەسەر بنچینەی چەوساندنەوە ئەڕوات ، پایەی لە سەر مڵکداریتی تایبەتی و خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنان و چەوساندنەوە دامەزراوە •

لە قۆناغی لەناوچونی فیودالیزمدا شێوەکانی بەرهەم هێنان لە شێوەی

ساكارەوە ئەگۆڕێت بۆ شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداریو لە قۆناغی سەرمایەداری‌دا جۆری بەرهەم هێنان گەشە ئەکاتو هەمو هۆیەکانی بەرهەم هێنان ئەبێتە ملکی سەرمایەداران •

هێزی کار لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا وەکو کەلوپەلی لێ دێت ، قۆناغی سەرەتایی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری پێی ئەڵێن هاریکاری سادەی سەرمایەداری(۱) ، کە شێوەیەکی کاری هەرەوەزیانەیەو سەرمایەداران کۆمەڵێك کرێکار پێکەوە ئەخەنە کار تاکو پێکەوە کارێك بە ئەنجام بگەیەنن ، قۆناغی دوای ئەوە پێی ئەوترێ - مانوفاکتور - کە لە روی زمانەوە بە مانای کارگە دەستی‌یە کانە •• ئەو جۆرە بەرهەم هێنانە سەرمایەداری‌یەیە کە لە سەر پایەی سیستەمی کارو تەکنیکی پیشەکاران دائەمەزرێت • بۆ نمونە کۆمەڵێك کرێکاری پیشەیی لە کارگەیەکدا هەریەکە کارێکی تایبەتی ئەکەن ، بەڵام بە هەمویان جۆرە کەلوپەلێك بەرهەم دێنن • یان هەر کرێکارێک بەشێك لە دروستکردنی بەرهەمێك تەواو ئەکات •

مانوفاکتورەکان هەلو مەرجی لەبار بۆ گۆڕینی جۆری بەرهەم هێنانی دەستی بە جۆری بەرهەم هێنانی چەرخ ئامادە ئەکەن ، بەمجۆرە ئەبێتە خاڵی ناوەندی نێوان بەرهەمە دەستی‌یەکانو سنعەتی گەورەی تەکنیكو مەکانیزە •

لە رووی مێژوویەوە گەشە کردنی هۆیەکانی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری لە ئەوروپای رۆژ ئاوادا لە سەدەکانی ناوەراستەوە دەستی پێکردوە ، بەڵام لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم کە بەرهەم هێنانی چەرخ پەیدا بو ، کارخانەی تەکنیکیو سنعەتی

---

(۱) Cooperation

چەرخ لە جیاتی مانوفاکتورەکانو کارگە پیشە دەستی‌یەکان دامەزران •
چەندان دەزگاو دامەزراوی گەورەی سەرمایەداری کشتوکاڵی پێک
هات •• کە کرێکاری کشتوکاڵی کرێگرتە لەگەل چەرخو مەکینەی
کشتوکاڵی‌دا کاریان تیا ئەکرد •

● **سکتاریسم** Sectarisme

واتا دورە پەرێز وەستان لە کۆمەلانی خەڵك ، گۆشە گیری ، ئەم
زاراوەیە لە وشەی « سکت » وەر گیراوە •• بە مانای دەستە یان کۆمەڵی
بچوك وەیان تیپ ئەگرێتەوە کە دەرگایان لەرووی خۆیان داخستبێ‌و
پەیوەندی‌یان لەگەل خەڵکدا نەبێت •

سکتاریسم ، لە مانای سیاسی‌دا جۆرە ئەپورتونیسمێکی چەپ
ڕەوانەیە لەناو ڕاپەڕینی کرێکاراندا ، سیاسەتێکە ئەبێتە هۆی دورە
پەرێز کردنی ڕێکخراوە شۆرشگێڕەکان لە کۆمەلانی خەڵك ••
سروشتی سیاسی سکتاریسم لە خەباتی چینایەتی‌و کۆمەلایەتیدا یان لە
پێش داخوازی‌یەکانی کۆمەڵەوەیە ، یان لەدوای ئەوانەوە ئەڕوات ••
سکتاریستەکان لە ئاستی جیهانیدا شێوازی پەیوەندی‌و ڕاپەڕینی
جەماوەریانەی سێ هێزی گەورەی دژی ئیمپریالیزمیان ناوێت وەکو :

**١ ـ ولاتە سوشیالیستی‌یەکان**
**٢ ـ ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلی**
**٣ ـ ڕاپەڕینی کرێکاران لە ولاتە سەرمایەداری‌یە پێشکەوتوەکانا**

سکتاریسم زاییندەی وەستانو دوگماتیسمو چەپڕەوی‌یە لە پێشتی

خۆیا خۆی ئەپێچێتەوەو پەیوەندی لەگەل کۆمەلانی خەلك دا ئەبچرێ‌و دەست ئەکات بە کۆنەپارێزی‌و کاری لادەرانە لە شێوازی تیوری شۆرشگێرانەو فەرامۆشکردنی دیالەکتیك‌و نەریتە کۆمەلایەتی‌یە کان •

سکتاریسم ، لە کۆمەلدا رێکخراوەکانی چینی کرێکار لە چین‌و توێژە یەکگرتوەکانی تری کۆمەل جیا ئەکاتەوە ، سکتاریسم جۆرێکە لە روالەت بینی لە کاری سیاسیانەدا زوربە ئەبەستێت بە کەمایەتیەوە •• تاك ئەخاتە پێش کۆمەلەوە ، قازانجی تاکە کەس‌و کۆمەلی تایبەتی ئەخاتە پێش قازانجی هەمو کۆمەلەوە •• بەربەرەکانێی سکتاریسم یەکێکە لە ئەرکە گشتی‌یەکانی سەرشانی رێکخراوە شۆرشگێری‌یەکان لەناو تێکرای کۆمەلدا •

● **سندیکا** Syndicat

ئەم زاراوەیە بەمانا رێکخراوی پیشەیی چینی کرێکارو زەحمەتکێشەکانی تر ئەگرێتەوە •• کە پێی ئەلێن « نیقابە » •• نەقابەکان لە ئەنجامی راپەرینی کرێکاران لە پێناوی داکۆکی کردن لەسەر قازانج‌و باشکردنی باری گوزەران‌و زەمینەی ژیانی ئابوری یان پەیدا بووە • یەکەمین نەقابە « تریدیونیون » لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمدا لە بەریتانیا ـ کە لەو کاتەدا یەکەمین تێکشکانی ولاتە سەرمایەداری‌یەکان بو ـ دامەزراوە • لە فەرەنسەش لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا ، لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ، لە ئەلەمانیا لە ناوەراستی سەدەی رابوردودا نەقابەکانی کرێکاران دامەزراوون •

لە کاتی گەشە کردنی قوناغە کانی سەرمایەداری‌دا ، کاتێك کە

هێشتا گۆڕینی سوشیالیستیانە نەهاتبوە کایەوە ، نەقابەکان بەرەبەرە بونە ڕێکخراوی هەمیشەیی‌و کەم تا زۆر بە پێی کات‌و شوێن ئەهمیەتیان پەیدا کردو بەهێز بون . لەو کاتەدا هێشتا ڕێکخراوێکی سیاسی کرێکاران دانەمەزرابو . نەقابەکان ڕێبازێکی سیاسی‌و ئاشکرا یان نەبو ، زوربەیان بە پێی دەستوری نەقابەکانی بەریتانیا واتە [ تریدیونیون ]ە کان کاریان ئەکردو هەمو چالاکی‌یەکانیان بریتی بو لە پاراستنی قازانجی خۆیان .

ئیستا لە گەلێك لە ولاتانی رۆژئاوادا نەقابەکان بە دەست کەسانی راستڕەوو ئەریستوکراسی کرێکارانەوەن . بەلام لە زوربەی ولاتە سەرمایەداری‌یەکانا نەقابەی چالاك‌و کار گوزاری تر هەیە کە تەنیا لە پێناوی قازانجی تایبەتی خۆیانا ـ واتە کرێکاراندا ـ تێ ناکۆشن . بەلکو چالاکی سیاسی هەمە جۆرەی خۆیان لە دژی سیستەمی سەرمایەداری ئەنوێنن .

ئەم نەقەبانە داکۆکی لەسەر قازانجی زەحمەتکێشان ، لە پێناوی دیموکراتی دا ، مافە پیشەیی‌یەکان ، ئازادی نەتەوایەتی ، دژی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی‌و جیاوازی رەگەزایەتی‌و چەوساندنەوە خەبات ئەکەن .. نەقابە پێشکەوتووەکانی سەرتاسەری جیهان لە پێناوی یەکێتی زەحمە تکێشانی ولاتە جۆربەجۆرەکاندا تێ ئەکۆشن . فیدراسیۆنی نەقابەکانی جیهان نمونەی ئەم یەکێتی‌یە جیهانی یەیە .

سندیکا ، مانایەکی تریش ئەگرێتەوە ، وەکو ئینحیساری سەرمایەدار ، کە بە پێی بڕیارو رێکەوتنی دەزگا ئینحیساری‌یەکان بۆ پێکەوە فرۆشتنی کەلوپەل‌و کڕینی کەرەسەی خاو دائەمەزێن‌و نرخێکی یەك بابەتی لەسەر کەلوپەل‌و کەرەسە خاوەکان دائەنێن .

## ● ستراتیجو تاکتیك Strategieet, Tactigue

زاراوەی ستراتیجو تاکتیك جگە لــە بواری سیاسیو حزبی ◦◦ لە کاروباری سەربازی ، دیپلوماتیــك وە یان کاروبــاری ئابــوریو ◦◦◦◦ بەکار ئەهێنرێت ◦ لە کاروباری سەربازی دا یەکەمیان بە مانای ئامانجو نەخشەی دورو کۆمەڵە کردارێـکی فراوانو تەواو بۆ سەرکەوتن لـــە جەنگدا ◦◦ دووەمیان بە مانای ئامانجی نزیك ، کرداری یــەك لــە دوای یەك ، چالاکی ناوچەیی بۆ سەرکــەوتن لــە جەنگێکی تایبــەتیدا نـــاو ئەبرێ ◦

بەڵام ئێمە لەم باسەدا مەبەستمان لە ستراتیجو تاکتیك رێـکخراوە شۆرشگێرییە کرێـکارییەکانە لەو راپەرینانەیاندا کە لە پێناوی رزگار کردنی کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتیدا ئەیکەن ◦◦ لــەم بوارەدا ســتراتیجو تاکتیك بریتییە لە زانستی رابەریکردنی راپەڕینی چینایەتی پرۆلیتاریاو هەو چینە زەحمەتکێشەکان ◦

ستراتیج بریتییە لە دیاریکردنی لایەنی ئەصڵی راپەڕینی چینایەتی پرۆلیتاریا ، دیاریکردنی رێکخستنو تایبــەتیەکانی لەشکری سیاسی بــە ڕابەرایەتی چینی پرۆلیتاریا لە قۆناغێــکی دیاریــکراوی شۆرش دا ◦◦ دانانی نەخشەی پێویست بۆ سود وەرگرتن لە کەرەسەو تەقەمەنی هێزە بنچینەییو لقییەکانی شۆرش ◦◦ دانانی نەخشەی یەکگرتنی هێزەکان لە راپەڕینی شۆرشگێرانەداو کۆ کردنەوەی ئەم هێزانە لە دەوری چینی پرۆلیتاریا ◦ ستراتیجــی هــەر رێــکخراوێــك لە مــاوەی قۆناغێــکی دیاریکراودا کە سەرگەرمی خەباتی ئازادیخوازانە بێت ، واتــە لە ماوەی سەرتاسەری تەمەنی شۆرشدا بە بێ گۆڕان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە ◦

## ● ستالینیزم Stalinisme

ئەم زاراوەیە تایبەتە بە یوسف فیساریو نوڤیچ ستالــن ، ۱۸۷۹ ـ ۱۹۵۳ سەرەك وەزیرو فەرماندەی گشت هێزی چەكدارو سـكرتێری گشتی حزبی كمونیستو دیكتاتوری پێشووی سوڤیەت •

ستالینیزم ئایدیۆلۆجی یەكی تایبەتی نیــە ، بەڵـكو بـەو كۆمەڵـە كرداره ئەوترێ كە لە سەردەمی حوكمڕانی ستالین دا لە روسـیە دا كراوە • كومونیستەكان لە سەردەمی ژیانی ستالین‌دا ئەویان بە گـەورە ترین لێـكدەرەوەی فەلسەفەو باڵا ترین سەرچاوەی تیوری شۆشگێڕانە دائەنا لە كۆڕی راپەڕینی نێو نەتەوەیی جیهانیدا

لە دوای مردنی ســـتالین‌و خۆ نیشاندان لـە دژی كردەوەكانـی ستالینیزمیان بە لادەر •••• دانا •• لـەو كـاتە بە دواوە ئیتـر وەكـو سەرچاوەیەكی تیوری تەماشا نەئەكرا •• ستالینیزم بە كرداری دڕندانەو ڕیژیمی پولیسی‌و تاكە پەرستی‌و دیكتاتور دانرا •

لە راپەرینی نێو نەتەوەییدا یوگسلاڤیا یەكەمین ولاتێـك بوو كـــە بەر لە هەر ولاتێـكی تر دژی رێبازی ستالینیزم وەستاو ئەوی بـە لادەر دانا(۱) •

## ● سیاسەت Diplomacy

**یەكەم :** ئـەو مـەبەست‌و ئامانجـانەیە كـە چینێكی كۆمـەلایەتی لە پێناوی سـەركەوتنی راپەڕین‌و پاراستنــی دەسـكەوت‌و قازانجـەكانیـا ئەیگرێتە بەر •

---

(۱) باسەكـــە لەوە درێژ ترە كـــە نوسراوە ، بەلام ئێمە ئەوەندەمان مەبەست بو كە لێرەدا نوسیمان ••

**وەرگێر**

**دووەم :**

شێوازی پاراستنی ئەو دەسکەوت‌و قازانجانەیە .. لەپلەی یەکەمدا بریتی‌یە لە کاروباری دەوڵەتی ، ڕێبازی دەوڵەت‌و بەڕێوە بردنی وڵات ، دیاریکردنی شێوەکانی ئەرك‌و ناوەڕۆکی چالاکیەکانی دەوڵەت .

سیاسەت ، ڕاپەڕینی چینایەتیانە نیشان ئەدات ، باری ئابوری هەر چینێك سیاسەتی ئەو چینە دیاری ئەکات . بە پێی قسەی تیوری زانەکان « سیاسەت ڕوخساری کوڵەکەی ئابوری‌یە » .

**سیاسەت دو شێوەیە :**

**١ ـ سیاسەتی ناوخۆ**

**٢ ـ سیاسەتی دەرەوە**

پەیوەندی نێوان چینەکان‌و نێوان نەتەوەکان لە ناو خۆی وڵاتێکدا بەشێکە لە سیاسەتی ناو خۆ . پەیوەندی نێوان دەوڵەتەکان‌و نێوان خەڵکەکان لە بواری نێو نەتەوەیدا ئەویش بەشەکەی تری سیاسەتە ، کە سیاسەتی دەرەوەی پێ ئەڵێن .

سیاسەتی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان لە سەر پایەو بنچینەی تیوری شۆڕشگێڕانەو ناسینی تەواوی یاساکانی گەشە کردنی کۆمەڵ دامەزراوەو بە قازاجی کۆمەڵ ئەڕوات . بۆیە پێویستە هەموو ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕانە جگە لە دیاریکردنی سیاسەتی دروست‌و کار کردن‌و لەسەر ڕۆیشتنی .. پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنجی پەروەردە کردنی سیاسیانەی کۆمەڵانی خەڵك بدات‌و هەروەکو چۆن سەرنجی کاروباری ڕێکخستن‌و دامەزراندن‌و پەروەردەی ریزەکانی خۆی ئەدات .

## سیستەمی هەڵبژاردن : Election System

سیستەمی هەڵبژاردن ئەوەیە کە لە وڵاتا بە پێی یاساو نەریتی تایبەتی ، بە پێی دەنگدان بڕیار لەسەر هەڵبژاردنی ئۆرگانە هەڵبژێردراوەکانی وڵات‌و دیاریکردنی ئەنجامی دەنگدانەکان ئەدرێ ..
سیستەمی هەڵبژاردن مەرج‌و ماف‌و ئەرکەکانی هەڵبژێردراوەکان‌و ئەوانەی دەنگ بۆ هەڵبژاردنەکە ئەدەن دەست نیشان ئەکات .

لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا ، لەگەڵ ئەو هەمو میلاکانەی چینایەتی‌و دارایی‌و نەتەوەیی‌و رەگەزی‌و جنسی‌و ئەمجۆرە شتانە کە هەیە کەچی بەشێکی زۆری خەڵکی زەحمەتکێش لە دەنگدان‌و خۆ پاڵاوتن بۆ هەڵبژاردن بێبەشن . لەو وڵاتانەدا سیستەمی هەڵبژاردن بە جۆرێک رێك ئەخرێ کە تا ئەوەندەی بۆیان بکرێ دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بپارێزێت .

هەڵبژاردن راستەو خۆ ، ئەبێت ، یان ناراستە وخۆ ئەبێت ، لە جۆری راستەو خۆیاندا ئەوانەی دەنگ ئەدەن راستەو خۆ بەشداری هەڵبژاردنی ئۆرگانی مەبەست ئەکەن . بەڵام لە هەڵبژاردنی نا راستەوخۆدا دەنگدەرەکان لە سەرەتاوە چەند کۆمەڵێك هەڵ ئەبژێرن‌و ئینجا ئەوانیش بە پێی دەنگ ئۆرگانەکان دیاری ئەکەن‌و هەڵی ئەبژێرن . هەروەها هەڵبژاردن بە نهێنی‌و بە ئاشکراش ئەکرێ ..

لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا دو سیستەمی هەڵبژاردن بەکار دێنن :

**١ ـ سیستەمی نیسبەتکاری دەنگەکان** Proportionne

**٢ ـ سیستەمی زوربەی دەنگەکان** Mayoritaire

له سیستەمی نیسبەتکاری دەنگەکاندا کورسی‌یەکانی پارلمان بە پێی نیسبەتی دەنگی کۆمەڵە بەشدار بووەکان دابەش ئەکرێ .. بەڵام له سیستەمی به پێی زوربەی دەنگەکان ئەو پاڵێوراوانە هەڵ ئەبژێردرێن که دەنگی زۆریان به دەست هێناوە . هەر پاڵێوراوێك دەنگی کەم بێنێ له پارلمان بێبەش ئەبێت . لەبەر ئەوە سیستەمی نیسبەتکاری دەنگەکان له وڵاتە سەرمایە داری‌یەکاندا سیستەمێکی دیموکراتییانە ترە .

## ● شوفینیزم Chauvinisme

ئەمە سیاسەتێکی کۆنەپەر ستانەیە ، ئامانجی ئەوەیە گەلانو خەڵکی وڵاتانی تر بکێشێتە ژێر دەسەڵاتو رکێفی خۆیەوەو ئاگری ناکۆکیو دوژمنایەتیکردنی نەتەوەکان بکاتەوەو رێزی نەتەوەکەی خۆی بدات به سەر هەمو نەتەوەکانی تری جیهاندا .. قازانجی نەتەوەکەی خۆی له پێش قازانجی هەمو نەتەوەیەکی ترەوە دابنێت .. ئەمە سیاسەتێکی بۆرجوازی‌یانەیە که پڕیەتی له میکرۆبی رەگەز پەرستێتی .

شۆڤینیەت هیچ رێزێکی نیشتمان پەروەری ناگرێت کە یەکێکە له ئەحساسە هەرە پیرۆزەکانی ئادەمیزاد . دوژمنایەتی نەتەوەکانی تر ئەکات ، هەمو ئامانجو تێکۆشانێکی زەحمەتکێشانی نەتەوەکانی تر ئەخاتە ژێر پێیەوە .. له جیاتی هاریکاری نێوان گەلانو پێشکەوتنی کۆمەڵانی خەڵکی تر تەنیا پێشکەوتنی نەتەوەکەی خۆی ئەپارێزێت .. ئیستیعمارو کۆنەپەرستیو داگیر کاران سود لە هەڵوێستی سیاسەتی شوڤینیستانە وەر ئەگرنو به پێی ئەو سیاسەتە ناکۆکی له نێوان نەتەوەکانا ئەنێنەوە . هیچ پەیوەندی‌یەکی نیشتمانیانەو سۆزی نیشتمان پەروەری‌یان نیە ، به پێی تەعەصوبی کوێرانەی خۆیان دوژمنایەتی هەمو نەتەوەکانی تر ئەکەن .

شۆڤینیەت هەوڵ ئەدات رێگا لە پێشکەوتنی نەتەوەکانی تر بگرێو بە هەر جۆر بێت دیلو ژێر دەستەیان بکات • رقی لە سەربەخۆییو دەسەلاتی خۆیی نەتەوەکانی تر ئەبێتەوە •• پشتگیریو هانی ستەمی نەتەوایەتی ئەدات بۆ یەکتر چەوساندنەوەو زەوتکردنی دەسەلاتی سەربەخۆیی یەکتر •

دەزگا دەسەلاتدارە کۆنەپەرستەکان گەلێك سود لەم سیاسەتە چەوتە وەر ئەگرن • فاشیستەکانیش ئەم سیاسەتەیان ئەکردە گورزی دەستی خۆیانو ئەیکەن • ئیستاش ئیمپریالیستە کان بە هۆی ئەم سیاسەتەوە ئاگری ناکۆکی نانەوەو دوبەرەکایەتیلەنێوان نەتەوەکانی جیهانی خۆش ئەکەن •

شوڤینیستەکان بەم سیاسەتەیان خزمەتێکی گەورە بە ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستانی جیهانی ئەکەن •

## ● عەینی وذهنی : Objectif, Subjectif

### عەینی Objectif

بەوە ئەڵێن کە لە دەرەوەی هۆشو ئاگاو هەستی مرۆڤدا بە شێوەیەکی راستەو خۆ هەیە • بە واتایەکی تر ئەوەیە کە پەیوەندی بە دەرونو بیرو هۆشو شوناسایی مرۆڤەوە نیە •

### ذهنی Subjectif

واتە ئەو شتەی کە لە ناو هەستو دەرونی مرۆڤدا هەیەو بە پێی تیوری ماتەریالیستی تیشکدانەوەی جیهانی عەینی یە • هەرچەند لە زۆر کاتو شوێنو باسو بابەتی هەمە جۆرەی کۆمەلایەتیانەو فەلسەفیانەدا

ئەم دوو وشەیە بە چەندان جۆر مانایان لێك ئەدرێتەوە • بەڵام لێرەدا ، لەم رونکردنەوەیەدا ماهیەتی ئایدیالیستیانەی ئەم تیوری‌یە بە ئاشکرا دەر ئەکەوێ •

● **فابینیزم** Fabianism

راپەڕینێکی سوشیالیستیانەیە **کە لە** بەریتانیا رویدا ، **لایەنگرانی** ئەم راپەڕینە لە ساڵی **١٨٨٤** دا لە « زانکۆی فابین » یەکیان گرتو سیدنی‌وب ، جورج برناردشو ، گراهام والاس ، هـ • ج • والز لە سەرکردەکانی ئەم راپەڕینە بون • فابینیزم راپەڕینێکی ئاشتیخوازانەیە ، ناوی خۆیان لە ناوی « فابیوس »ی سەرداری روم وەرگرتوە ، کە بە هێمنی‌و لەسەر خۆیی‌و شەڕو کشانە دواوە [ هانیبال ]ی سەرداری [ کارتاج ]یان شکاند • برناردشۆو فابینەکانی تر لایەنگری تیوری « ستوارت میل » و « هنری جورج » بون •

لە دوای دامەزراندنی خزبی کرێکاران ، چونە ناو حزبەکەوە •• بەڵام قەوارەی بوونی خۆیان نە دۆڕاند ، وەکو کۆمەڵە رۆشنبیرێک لەناو ئەو رێکخراوەدا کەوتنە چالاکی نواندنی رۆشنبیرانە •

● **فاشیزم** Fascisme

مانای زانستیانەی ئەم زاراوەیە بریتی‌یە لە ریژیمێکی دیکتاتۆریانە کە لەسەر زۆرداری‌و کوشتن‌و مل هوڕی دامەزرابێ ، کە بە هۆی کۆنەپەرست ترین‌و دەست درێژکار ترین شێوەی ئیمپریالیستەوە سەقامگیر بێت •

سەرمایەدارە چاو چنۆکەکان پشتگیری لە فاشیزم ئەکەن بۆ ئەوەی

ڕژێمی سەرمایەداری خۆیانی پێ بپارێزن • حکومەتە فاشیستەکان هەمو مافە ئازادیو دیموکراتیەکانی وڵات لەناو ئەبەنو سیاسەتی پیاوکوژانەی خۆیان ئەبەستن بە پاشکۆی نەتەوە پەرستی کوێرانەو ڕەگەز پەرستیەوە •

فاشیزم لەناو گێژاوی گشتی سەرمایەداریدا دێتە کایەوە ، لەو قۆناغەدا کە بەربەرەکانێی نێوان پرۆلیتاریاو بۆرجوازی توندو تیژ تر ئەبێت ، بۆرجوازی توانای ئەوەی نامێنێ لە ڕێگای پارلمانەوە حوکمو دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت پەنا ئەباتە بەر تیرۆرو تۆقاندنو سەرکوتکردنی خوێناویانەی هەمو جۆرە ڕاپەڕینێکی کرێکاریو دیموکراتی • هەروەها دەس ئەکات بە بڵاو کردنەوەی پروپاگەندەی خەڵک خڵەتێنەرانە •

فاشیزم بە پێی حوکمی سیاسەتی ناو خۆیی خۆی هەمو ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانو نەقابەو ئازادیە دیموکراتیەکان قەدەغە ئەکاتو دەزگاکانی دەوڵەت ئەکات بە دەزگاو حوکمی سەربازیو دەست بەسەر هەمو ژیانی کۆمەڵایەتی وڵاتدا ئەگرێ •

فاشیزم بۆ ئەوەی مەبەستەکانی خۆی بێنێتە دی سود لە تاقمو دەستەو کۆمەڵە دەست وەشێنەرەکانو پیاو کوژو عونسوری وەکو ( S - S )ەکانی ئەڵمانیای هیتلەریو کراس ڕەشەکانی ئیتالیای موسولینی وەر ئەگرێت • بنچینەی ئایدیۆلۆجی فاشیزم لەسەر ڕەگەز پەرستیو شۆڤینیستیو ئەمجۆرە تیوریە کۆنەپەرستانانە دامەزراوە •

لە ڕووی مێژوویەوە فاشیزم یەکەمجار لەساڵی ١٩١٩ دا لە ئیتالیا پەیدا بو ، لە دوای سێ ساڵ توانی دەست بەسەر هەمو دامو دەزگا

کانی دەوڵەتدا بگرێ • حزبی فاشیستی ئەڵەمان لە ساڵی ١٩٢٠ دامەزرا ، بۆ خەڵك هەڵفریواندنو خەڵك خڵەتاندن ناوی حزبی ناسیۆنال سوشیالیستی لە خۆی نا ، ئەم حزبە لە ساڵی ١٩٣٣ بە هۆی یارمەتیدانی دەزگا ئینحیساری‌یە گەورەکانی ئەڵەمانو دەرەوە حکومەتی گرتە ژێر دەستی خۆیو دیکتاتۆری خوێناوی هیتلەری سەقامگیر کرد •

تاقیکردنەوەکانی راپەڕینی کرێکارانی ئەڵەمانیا لەو کاتەداو رەوۆشتی ئەپورتونیستانەی سوشیال دیموکراتە راستڕەوەکان بون بە هۆی تێکشکاندنی هێزی کرێکارانی ئەڵەمانو سەرکەوتنی فاشیستەکان ، لە ئەڵەمانیای هیتلەریدا حزبە شۆرشگێڕەکانو نەقابەکانی کرێکارانو هەمو رێکخراوە دیموکراتیەکانی تر یەك لە دوای یەك سەرکوت کران • ستەمێکی رەش دەسەڵاتی خۆی داسەپاند • چەندان ئەدیبو رۆشنبیری ئەڵەمانی لە ئەنجامی زەبرو زەنگی دیکتاتۆریانەی هیتلەری یەکانو سیاسەتی فاشیستەکان ناچار بون وڵات بەجێ بهێڵن •

فاشیستەکان سودیان لە تیوری جیوپلیتیکانەو هاندانی دەزگا ئینحیساری‌یە گەورەکان وەر ئەگرتو ئەمەش بوو بە هۆی ئەوە کە جەنگێکی سەرتاپاگیری جیهانی لە پێناوی سەرلەنوێ دابەشکردنە وەی جیهان هەڵبگیرسێنن • ئەوە بو دوەمین جەنگی جیهانی یان هەڵگیرساند ، کە لە ئەنجامدا بوو بە هۆی تێکشکاندنو لەناوبردنی توانای سەربازیو ئابوریو سیاسی کۆنەپەرستانەی فاشیستەکانو سەرکەوتنی بەرەی گشتی گەلان بەسەر فاشیزمدا •

لە دوای ئەم تێکشکاندنەی بەرەی فاشیزم جارێکی تر عونسورە فاشیستەکان لە وڵاتە ئیمپریالیستی‌یەکانا کەوتنەوە چالاکی فاشیستیانە نواندن • دەزگا ئیمپریالیستیەکانو کۆنە پەرستان یارمەتیان ئەدان ئەرکی

بەروەردە کردنیان ئەکێشان • لە ئەڵەمانیای ڕۆژئاوادا حزبێـکی فاشیستی تازە بە ناوی « ناسیۆنال دیموکرات » لەسەر ڕەووشـــتی فاشیســتەکان دامەزرا ، لە بەریتانیاش دیســان چەندان دەستەو کۆمەڵـی فاشیســـتی چالاکی خۆیان ئەنواند • لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش چەندان دەستەو کۆمەڵی فاشیستیانە دامەزراوون • لە فەرەنسەمش ڕێـکخراوێـکی وەکو لەشکری نهێنی هەیە کە پیاوە کۆنەپەرستە سیاسیەکان ڕابەرایەتی ئەکەن • یان ڕێـکخراوێـک هەیە کە پێی ئەڵێن « ئوکسیدان » • لـە ئیتالیا چەندان ڕێکخراوی فاشیســتی هەمە جۆر هەیە کە خۆیان ناو ناوە « ڕاپەڕینی سوشیالیستیانەی ئیتالیا » • ڕیژیمی ســەرمایەداری یارمەتــی هەمو ئەم ڕێـکخراوە فاشیستیانە ئەدات •• ئەمەش هەموی لـە پێنـاوی سەرکوت کردنی ڕاپەڕینی کرێـکارانو کۆمەڵانی خەڵك دا •

هەروەکو باسمان کرد ، فاشیزم بەرهەمی ئیمپریالیزمو دەزگـــا ئینحیسارییەکانە ، هەروەها نازیزم هەمان ناوەڕۆکی فاشیزمی هەیەو ئەم وشەیە لە پیتە سەرەتاییەکانی ناوی حزبی فاشیستی هیتلەر وەر گیراوە ، کە پێی ئەوترا « حزبی کرێـکارانی نەتەوەییو سوشیالیستی »وە بێگومان ئەو حزبە نە کرێـکاری بووەو نە نەتەوەییو نە سوشیالیستی •

● **فالانخیزم ـ فالانژیزم** Falangisme

ڕاپەڕینی فاشیستەکانی ئەسپانیایە ، واتە ئایدیۆلۆجی تاکە حزبـی یاسایی ئەسپانیا [ فالانخە ئەسپانیۆ لاتراد یسیونالیستا ]یە(۱) •

فالانخیزم ، یەکەمجار [ خوزە ئانتونیو پریمودو ریورا ]کـوڕی دیکتاتۆری پێشو پریمودوریورا لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۳ دا دایمەزراند • لە مانگی مارس‌دا فالانخیستەکان لەگەل دەستەو کۆمەڵـە

(۱) Falange Spanola Tradicionalista

فاشیستەکاندا بون بە یەك ، فالانخە ئەسپانیۆلای یەکگرتوویان بەرابەری « خوزەریورا » پێك هێنا • بە پێی بەرنامەیەکی تاکرەوی کە هەمو حزبە سیاسی‌یەکان لەناو ببات‌و سەرمایەی ولات میلی بکات‌و چارەسەر کردنی زەوی‌و زارو فراوانبوونی لەشکرو رەووشتی شۆرشگێرانەی گرتە خۆ بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگات • لە شەرە ناوخۆیەکانی سالانی ( ١٩٣٦ - ١٩٣٩ ) رۆلێکی گەورەی دیاری کرد • ئەم حزبە زۆر دژی چەپەکان بو ، لەگەل راستە مام ناوەندی‌یەکانیشدا نە ئەگونجا ، لەگەل « سوشیالیستەکان ،•••، ئانارشیستەکان » گەلێك گێرەو کێشەی نایەوە • ریورا لە مانگی شوباتی سالی ١٩٣٦ دا دەستگیر کراو لە مانگی تشرینی دوەمی هەمان سالدا کوژرا • لە مانگی نیسانی سالی ١٩٣٧ دا بە فەرمانی جەنرال سیموفرانکو سەرکردەی لەشکر ، فالانخە لەگەل راپەرینی سەلتەنەتخوازی « کارلیست » دا یەکیان گرت‌و فرانکو ئایدیۆلۆجی فالانخەی هەلبژاردو ئەم حزبە بو بە حزبی سیاسەتی دەولەت • بەلام تا ئیستا نەیتوانیوە هیچ بەرنامەیەکی خۆی جێبەجێ بکات •

**فرماسیونی کومەلایەتی ئابوری :ـ** Socio - Economic Farmasion

فرماسیون ، یان سیستەمی کۆمەلایەتی ـ ئابوری بریتی‌یە لە رێرەوی دیارو سەرخانێکی لەبار لەگەلیا • لە مێژووی ئادەمیزادا پێنج سیستەمی کۆمەلایەتی ـ ئابوری بەدی ئەکرێ •• کە بریتین لە :

« **کۆمەلگای سوشیالیستی سەرەتایی ، کویلەداری ، فیودالیزم ، سەرمایەداری ، سوشیالیزم** » •

هەریەك لەم سیستەمە کومەلایەتی ـ ئابوری‌یانە یاسایەکی تایبەتی پەیدا بون‌و گەشەکردنی خۆی هەیە • لە هەمان کاتا یاسایەکی گشتی شیان هەیە •• گۆرین لە روخسارێکەوە بۆ روخسارێکی تر شتێکی

رێـکەوت نیەو نەبووە ، بەڵـکو بە پێی یاسایەکی تایبەتی پێویست ئەنجام ئەگرێت •

بەو جۆرە کە لە ناو دەرونی کۆمەڵدا ناکۆکـی تایبەتی ئەخولقـێ کە ئەبنە هۆی لەناوبردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی کـۆنو هاتنـە کایـەی سیستەمێـکی کۆمەڵایەتی تازەو پێشـــکەوتوانە تـر • لـە کۆمەڵـگای چینایەتیدا لە ئەنجامی بەربەرەکانێی نێوان چینە ناکۆکەکان ، سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەگۆڕدرێتە بارو دۆخێـــکی تر • لە ئەنجـــامی راپەڕینی شۆرشگێڕانە چینە پێشکەوتووەکان دەسەڵاتی چینە دواکەوتووەکان لەناو ئـەبەن •

● **فارمر** . Farmer

وشەیەکی ئینگلیزییە ، بە مانا خاوەن زەوی یان خـاوەن کێڵـگە ئەگرێتەوە •• فارمر بریتییە لە خاوەن زەوی یان ئەو کەسـانەی کـــە پارچەیەك زەوی بەکرێ ئەگرن بۆ ئەوەی بەرو بومی کشتوکاڵی بەرهەم بێنن • هەندێـك کات فارمەرەکان خاوەن ئابوورییەکی کشتوکاڵی شێوە سەرەتایین ، ئەمجۆرەیان بە تایبەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا گەشەیان کردوە ، لە ئەمەریکـا ژمارەیەکـی زۆر لـە فارمـەرە بچوکەکان ماڵوێران کرانو لەســـەر زەویو زاری خۆیـان دەرکـران فارمری گەورەو بە دەسەڵات زەویو زارەکانیان گرتـە ژێـو دەســـت خۆیانەوە • تەنانەت ئیستاش هەر لـە ئەمەریکـادا خـاوەن زەویوزارە بچوکەکان لەسەر زەوییەکانیـان دەر ئەکرێـنو خـاوەن زەویو زارە زۆرەکان کە سەرمایەی زۆریان بەدەستەوەیە چەندان ناوچەی کشتوکاڵیو کێڵـگەو زەویو زاری زۆر بەڕێوە ئەبەن • لە هەندێـك وڵاتانی تریشدا هەمان مەسەلە دوبات بۆتەوە • خاوەن زەویو زارە بچوکەکان لەســەر

زەوی‌یەکانیان دەر ئەکرێن‌و خاوەن زەوی‌وزارە بە دەسەڵاتەکان دەست بەسەر زەوی‌یەکانیانا ئەگرن‌و داگیری ئەکەن •

## ● فیودالیزم Feodalisme

فیودالیزم ، ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتی – ئابوری یەیە کە لە ئەنجامی لەناوچونی کۆمەڵگای کۆیلەداری یان راستەو خۆ لە ئەنجامی لەناوچونی کۆمونی سەرەتایی بە پێی چەند خاسیەتێکی تایبەتی خۆی لە هەر وڵاتێکدا ، یان لە زوربەی کیشوەرەکانی جیهاندا هاتۆتە دی •

هۆیەکانی پەیدا بونی ئەم قۆناغە کۆمەڵایەتی‌یە لە مناڵدانی کۆمەڵگای کۆیلەداری‌دا بە شێوەی کۆلۆن خولقا • کۆلون بریتی بون لەو کۆیلە ئازاد کراوانە یان ئەو زەحمەتکێشە ئازادانە کە هەر یەکەیان بە پێی چەند مەرجێکی تایبەتی پارچەیەك زەوی‌یان لە خاوەن زەوی‌و زارەکان وەر ئەگرت • هەروەکو ئەرکێکی سەرشانیان ئەبوا زەوی خاوەن زەویە کان بکێڵن‌و بەشێکی زۆر تر لە بەشی خۆیان بە خاوەن زەوی‌و زارەکان بدەن‌و بە پێی رێکەوتنی نێوان خۆیان – واتە کۆلۆن‌و خاوەن زەوی‌یەکان – بێگارو باج‌و خەراجی تریان بدابایە •

لە کۆتایی سەردەمی کۆیلەداری ، ئەم شێوەی کار کردنە دەرامەتی بۆ خاوەن کۆیلەکان زۆر تر بو ، کشتوکاڵ کارە تازەکان پا بەستەی زەوی‌وزار بون ، واتە لەگەل زەوی‌وزارەکانا ئەفرۆشران‌و ئەکڕدران •• بەڵام ناوی کۆیلە یان کڕدراویان لەسەر نەبو • ئەمجۆرە زەحمەتکێشە تازانە کە بە زمانی رۆمی پێ‌یان ئەڵێن « کۆلۆن » هەمان سرف یان رەعیەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بون •

بەرەبەرە جیاوازی لە نێوان کۆیلە ئازادکراوەکان‌و کۆلۆنەکان‌و

جوتیاره ئازادەکانا نەماو هەمویان بون بە خەڵکی زەحمەتکێش •• واتە « رەعیەت »، کە لە رۆژئاوا « سرف »ی پێ ئەوترا • بەو جۆرە سەردەمی فیودالیزم دیسان بە سەردەمی « سرواژ »یش ناو ئەبرێت •

لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری فیودالیزمدا چینە بنچینەییەکانی کۆمەڵ بریتین لە جوتیاران « رەنجدەران »و خاوەن مڵکەکان ، واتە فیوداڵەکان [ بەرهەم خۆرەکان ] • لەم قۆناغەدا جوتیارانو پیشەکارەکان گەورە ترین هۆی شۆرشگێرانەن •

لە کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی کۆندا ، بە پێی ئەو پشکنینو لێکۆڵینەوانەی کە تا ئێستا بە دەست گەیشتووە دەر ئەکەوێ کە دابەشکردنی کۆمەڵ لە سەرەتاوە بە ئازادو کۆیلەداری نەکراوە ، بەڵکو کراوە بە دو کۆمەڵ : دەوڵەمەندو هەژار •• سەرەك هۆزەکان ، سەرکردەکانی لەشکر ، پیاوە ئاینییەکان ، هەریەکە بە پێی ئەرکی تایبەتی خۆیانو خاوەندارێتی زەویوزار ، ئاودێری ، ئاژەڵداری ، و •• ئەمجۆرە کارانە دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند بون • توێژەکانی تری کۆمەڵیش هەژارو دەسکورت بون •

یەکگرتنی هۆزەکانو دامەزراندنی شانشینی بچوكو هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی دەوڵەتی رێگای گەشە کردنی ئەم کۆمەڵگایە بون ، کە ریژیمی کۆیلەداری دەسەڵاتی بەهێزی تیایا نەبو • هەرچەند خاوەن کۆیلەکان لە ئارادا هەبون بەڵام هەرگیز وەکو چینێکی فراوانو هێزی بنچینەیی کۆمەڵ دەر نەئەکەوتن •

سەردەمی فیودالیزم ، قوناغێکی پێویستی پێگەیشتنی کۆمەڵگای ئادەمیزادبو ، وە لە کاتی خۆیا گەلێك یارمەتی گەشە کردنی هێزە بەرهەم

هێنەرەکانی داوە • شیرازەی بنچینەیی بەرهەم هێنانی ئـەو سەردەمـی کشتوکاڵی بو • هۆیە بەرهەم هێنەرەکانی سەردەمی فیودالـی لەسـەر خاوەندارێتی زەوی‌و زار ، تارادەیەك خاوەن رەعیەتی بو •

رەعیەت ، کۆیلە نەبو ، چارەنوسی ژیانی بەدەست خاوەن ملـکەوە نەبو ، راستەوخۆ نە ئەفرۆشرا • ئەگەرچی لەگەل پارچە زەویەکدا کـە ئەفرۆشرا رەعیەتەکەشی پێوە ئەرۆیشت •• لەو سەردەمەدا خاوەندارێتی فیودالی‌و خاوەندارێتی تاکـە کەسی وەکو جوتیارو پیشەکارە خـاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنان هەبون • بەرهەمی زیادەی رەعیەتەکـان ئەدرا بە خاوەن ملکەکان بە شێوەی کرێی ئەو زەوی‌وزارانەی کـە ئـەیان کێـلاّن •

● **فیدراسیۆن** Fedration

لە وشەی Foederatus ی لاتینی‌یەوە وەرگیراوە کـە بە مانا « کۆکردنەوە » ئەگرێتەوە • یەکێتی نێـوان چـەند رێـکخراوێـك یان ولاّتێـك ، دامەزراندنی دەوڵەتێـك لە فیدراسیۆن دا چەندان دەستەو کۆمەڵ‌و رێـکخراوی بچوك بە زۆری کاروباری دەرەوەی خۆیان ئەدەنە دەست فیدراسیۆنەکەیان • یاسای بنچینەیی فیدراسیۆن سنوری ناوخۆی ئەندامانی فیدراسیۆنەکە دیاری ئەکات •

لـە سیستەمی ئـەو دەوڵەتانەدا کـە فیـدرالن دادگـایەکی باڵا هەیە کە یاسای ولاّت دائەنێت‌و ناکۆکی نێوان دەوڵەتەکانـی ئەندامـی فیدراسیۆنەکە چارەسەر ئەکات •• لەو جۆرە دەوڵەتانەدا یاسای بنچینەیی بە پێی راوێژی دەوڵەتانی ئەندامی فیدراسیۆنەکە دائەنرێت •

● **فابیانیسم** Fabianisme

ڕێبازی سیاسی ڕێکخراوێکی سوشیالیستی‌یانه‌یه له به‌ریتانیا ، که له لایه‌ن ڕوشنبیره سوشیالیستی‌یه‌کانی ئه‌و وڵاته‌وه له ساڵی **١٨٨٤** دا دامه‌زراوه • ئه‌مانه زۆر هه‌وڵیان داوه که‌سوشیالیزم له چینی ناوه‌ڕاست پێک بێنن‌و له هه‌مان کاتا لایه‌نگری پێک هێنانی سوشالیستی له‌سه‌ر خۆ بون • ئه‌مانه له دوایدا بونه پایه‌ی دامه‌زراندنی ڕێکخراوی کرێکارانی به‌ریتانیا ، دوای دامه‌زراندنی ڕێکخراوه‌که‌ش له‌و باوه‌ڕه‌دا بون که :

**یه‌که‌م :**

چاره‌سه‌ر کردنی کۆمه‌ڵایه‌تیانه باری ژیان‌و گوزه‌رانی کرێکار باش ئه‌کات‌و ئیتر هیچ پێویستی به شۆرش‌و ڕاپه‌ڕین‌و توندو تیژی ناکات •

**دووه‌م :**

هیچ جۆره پێکا هه‌ڵچوونێکی چینایه‌تی بۆ به‌رزبونه‌وه‌ی ئاستی کۆمه‌ڵایه‌تی پێویست نیه •

● **ڤیتۆ** Veto

ڤیتۆ به‌رگرتنه له کارێک‌و « مافی ڤیتۆ » ماف یا توانای به‌رگرتنه •• به‌م پێ‌یه « ڤیتۆ » یان « مافی ڤیتۆ » ده‌سه‌ڵاتی یاسایی ده‌زگایه‌کی ده‌وڵه‌تی یان ئه‌ندامانی ئه‌و جۆره ده‌زگایانه‌یه بۆ به‌رگرتن له کاری ئه‌و ده‌زگایه یان هه‌ر ده‌زگایه‌کی تر ، یان ئه‌ندامه‌کانی بێت •

ئه‌م زاراوه له بواری یاسایی چالاکی‌یه‌کانی ڕێکخراوی نه‌ته‌وه

یەکگرتووەکاندا مانایەکی تایبەتی هەیە ، لەم بارەیەوە مافی ڤیتۆ بـــە مانای مافی ئەندامێـکی هەمیشەیی ئەنجومەنەکەیە بۆ بەرگــــرتن لــــە کارێـک کە دەنگی لەســەر درابێـت لـە لایـەن ئەندامانـــی تـری ئەنجومەنەکەوە •

لە یاسای گشتی نیشتمانیدا ڤیتۆ بە مافی سەرچاوەیەکی خـاوەن لێپرسینەوە بۆ بەرگرتنی یان دوا خستنی کارێـکی یاسـایی ئەوترێت •• لە رۆمی کۆندا « تریبونەکانی خەڵك »بۆ رەتکردنەوەی یاساو دەستوری فەرمانبەرانی تر سودیان لە بەکار هێنانی مافی ڤیتۆ وەر ئەگرت •

ڤیتۆ لـەروی مێژوویـیـەوە تارادەیـەك بـــە کارێـکی یاســـایی بەربەرچدانەوە واتە [ رەتکـردنەوەی یاسـا ] لـە لایـەن ئۆرگانێـکی دەسەڵاتداری نیشتمانیەوە دائەنرێت • لە کاتی نائاساییشدا هەندێـك لە دەزگا یاساییەکانی وەکو ئەنجومەنی لوردەکانی بەریتانیا ، دەسەڵاتـــی ئەوەیان هەیە کە هەر کارێـک بیانەوێ بە هۆی بەکار هێنـانی مافـــی ڤیتۆوە دوای بخەن • پادشای بەریتانیا مافی ڤیتۆی هەیە بەڵام هەرگیـز سودی لێ وەر نەگرتووە چونکە لە کاتێـکدا لێپرسینەوە لە ئەســـتۆی ئەنجومەنی وەزیراندا بێت ئیتـر ئەو مافـە پـوچ بۆتـەوە •• بـــەڵام سەرکۆماری ئەمەریکـا ئەتوانێت یاسایەك رەت بکاتەوە کـە کونگـــرە بریاری لەسەر دابێت ، مەگەر لە کاتێـکدا نەبێت کـە دیسـانەوە دوو سێ‌یەکی کۆنگرە دەنگی لەسەر بداتەوە •

هەریەك لە ئەندامانی ئەنجومەنی «بۆڵەندە ـ لهستان » لـە سەدەکانی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا تاکو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکە واتە ساڵی ١٧٩١ هەمویان مافی بەکار هێنانی ڤیتۆیان هەبوە ، وە هەریـەك لــــەو ئەندامانە توانای ئەوەیان هەبوە هەر کارێـکی دەنگ لەسەر دراو هەڵ بووەشێننەوە •

بەڵام ئەم زاراوەیــە لــە ڕێـکخراوی نەتــەوە یەکگـرتووەکانـا مانایەکی ـ تارادەیەك ـ جیاوازی هەیە • بەندی (٢٧) بیستو حەوتەمی بلاّو کراوەی ڕێـکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەڵێت :

« تەنیا لە بارەی کاری یاسایی‌و چارەســەر کردنـی ئاشتیانەوە لایەنی سەرپێچی کار ناتوانێت ڕای خـۆی دەر ببڕێ ، ئەبێت لەگەل ڕای هەر حەوت دەوڵەتـە ئەندامەکەی ئەنجومەنەندا بێت » •

لەبەر ئەمە بەکار هێنانی مافی ڤیتۆ لە ئەنجومەنەکەدا بــە دەسـت ئەندامێك یان چەند ئەندامێـکی هەمیشەییەوە یە بۆ بەرگرتن لە هــەر کارێـکی یاسایی‌و سیاسی کــە بیانەوێ نەکرێت •

● **کۆیلەیتیی** Escalavagisme

کۆیلەیتی یەکەمین شێوەی بەند کردنی کۆمەلایەتی ـ ئابوری‌یە لەسەر بنچینەی سود وەرگرتنی کەسێـك لە کەسێـکی تر دامەزراوە ، کۆیلەیتی لە قۆناغی لەناو چوونی کۆمونی سەرەتاییدا لەســەر پایـەی یەکسانی نەبونی باری ئابوری تاکەکەس ، لــە ئەنجامــی پەیـدا بونـی ملکداریتی تاکەکەس هاتە کایەوە •

ئەم کۆیلەیەتی‌یە یەکەمجار لە میسری کۆن ، بابل ، ئاشور ، چین ، هیندوستان‌و ••• پەیدا بو ، بەلاّم یۆنان‌و ڕۆمی کۆن بە شێوەی کلاسیکی خۆی پێـگەیشت •• لە ڕۆژ هەلاّتدا بە زۆری کۆیلەیێتـی خاســیەتی سەردەمی « باوك سالاری » بو[1] ••

---

(١) ئەو سەردەمە کۆمەلایەتی‌یە کە ئەرکی گەورەی مال بەسەر پیاوانەوە بووەو لە ئێراندا پێی ئەڵین «پدر شاهی»یان «پدر سالاری» •
**وەرگێر**

دو چینی کۆمەڵ ـ کۆیلەو خاوەن کۆیلە ـ رواڵەتی ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌یەیان نیشان ئەدا • چینە ناوەندی‌یەکان وەکو خاوەن مڵکە بچوکەکان‌و پیشە کاران‌و عونسورە بێ چینەکان کە لە خاوەن مڵکە بچوکەکان دواکەوتو تر بون‌و کۆیلەیان نەبو ، هەمویان لە ئارادا بون‌و هەبون •

پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان لەو سەردەمەدا بریتی بون لە خاوەن کۆیلەکان‌و خاوەن هۆیەکانی بەرهەم هێنان •• کۆیلە وەکو کەرەسەیەکی بازرگانی کرین‌و فرۆشی پێوە ئەکرا • خاوەن کۆیلەکان خاوەنی گیانی کۆیلەکان بون • خاوەن کۆیلەکان چەند توێژێکی جۆر بەجۆر بون وەکو خاوەن مڵکە گەورەکان ، خاوەن کارگەکان‌و مامەڵە چی‌یەکان •

ناکۆکی چینایەتی کە راپەرینی کۆیلەکانیشی ئەگرتەوە سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆیلە داری گۆری ، جۆرە چەوساندنەوەیەکی تری کۆمەڵایەتی جێگای گرتەوە ، ئەویش سیستەمی فیودالی بو • ئەم سیستەمە لە چاو رابوردوی پێشکەوتوانە تر بو ، ماوەی فراوانتری لە بەردەم گەشە کردنی هێزەکانی بەرهەم هێناندا رەخساند • ئەگەرچی روخساری کۆمەڵایەتی ـ ئابوری کۆیلەیتی وەکو قۆناغێکی مێژوویی گەشە کردوی کۆمەڵایەتی لەناو چو ، بەڵام مەسەلەی کۆیلەیتی بە چەندان شێوەی جۆربەجۆر لە رۆژگاری فیودالیزمدا ـ تەنانەت تا گەلێک دواتریش ـ هەر مایەوە • بۆ نمونە ، تا ماوەی زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر(١) لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا ، یان لە بەشێکی زۆری وڵاتە ژێر دەستەو شێوە ژێر دەستەکانا تەنانەت تا ئیستاش هەر ماوەتەوە •

---

(١) لە سەردەمی نوسینی کتیبەکەوە ئەگرێتەوە •

## ● کۆماری Republic

جۆرە حکومەتێکە ، کە جێگەداری سەرۆکی دەوڵەت کارێکی میراتگرانە نیە ، زوربەی جار ماوەی حوکمی سەرۆکی دەوڵەت دیاری ئەکرێ ، دیاریکردنی سەرکۆمار بە هەڵبژاردنی خەڵك ئەبێت • مەفهومی کۆماری بە زۆری روخساری دیموکراتیانە ئەبەخشێ •• بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە زۆر دیکتاتۆری ناسەڵتەنەتی ئەوترێت • بەڵام ئەو کۆمارە دیکتاتۆریانە مەفهومی سروشتی یان « نا سەڵتەنەتی » یە •

لە رێبازی سیاسیانەی رۆژ ئاوادا ، بەر لە شۆرشی ئەمەریکاو فەرەنسە ، بە هەمو دەوڵەتێکیان ئەووت کۆماری ، تەنانەت بە دەوڵەتە سەڵتەنەتیو ئاریستوکراسیە کانیشیان ئەووت • ئەو دەوڵەتانەش کە ئازادی سیاسییان تێدا کەم بوو ، بەڵام قازانجی خەڵکیان ئەپاراست پێیان ئەوتن « کۆماری » •

ژان بودن(٢) ، سیاسەتمەداری ناسراوی سەدەی شازدەیەم لە کتێبی « کۆماری » دا باسی سەڵتەنەت ، ئاریستوکراسی ، دەوڵەتی خەڵکی ئەکات •

لە سەردەمی شۆرشی ئەمەریکاو فەرەنسەدا بەو دەوڵەتانەیان ئەووت کۆماری کە یاسایەکی ئازادی هەبایەو مافی شارستانێتی هاو نیشتمانیو ئازادی تاکەکەسی تیا بپارێزرابایە • ئەو کەسانەی کە دژی سیستەمی سەڵتەنەتیش بون پێیان ئەووتن « کۆماریخوازەکان » •

بەڵام دوای سەقامگیر بونی دیموکراسی لە زوربەی دەوڵەتە سەڵتەنەتییەکانا کۆماریخوازی ئەو ناوەی خۆی لە دەست دا • چونکە

(٢) J-Bodin

دەوڵەتە سەڵتەنەتی‌یەکان وایان لێ هات خەڵکیان بە سەرچاوەی دەسەڵاتی خۆیان ئەزانی نەك ئیرادەی خواوەندی • هەندێك لە کۆنە پارێزە ئەمەریکایەکان مانای کۆماری‌یان بە حکومەتی مەشروطە ، حکومەتی یاساو یاسایی بوونی حکومەتیان لێك ئەدایەوە •

**کۆماری‌یە تازەکان ئەکرێن بە ۳ سێ بەشەوە :**

**یەکەم :**

کۆماری‌یە دیموکراتی‌یەکانی رۆژ ئاوا کە ریشەیان ئەگاتەوە سەر شۆرشەکانی سەدەی هەژدەیەم‌و نۆزدەیەم وەکو « فەرەنسەو ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا »••یان ئەو ولاتانەی کە لە دوایدا ئەم رێبازەیان گرتە بەر ، وەکو [ ئیتالیا ، ئەڵمانی رۆژ ئاوا ] •• لەم ولاتانەدا کۆماری شان بە شانی دیموکراسی ئەڕوات ، پلەی دیموکراسی لەو ولاتانە لەگەل ولاتە سەڵتەنەتی‌یە مەشروطەکانی ئەوروپای رۆژئاوادا وەکو ولاتەکانی ئەسکەندیناڤیە ، بەریتانیا ، هۆڵەندە ، هیچ جیاوازی یەکیان نیە •

**دووەم :**

ئەو ولاتانەی کە بە رەسمی کۆمارین‌و کەچی لە هەمان کاتا ریژیمی سەربازی‌و پۆلیسی تیایانا حوکمڕەوایە ، وەکو زوربەی ولاتەکانی ئەمەریکای ناوەندو خواروو پورتوگال‌و ئەسپانیا •

**سێیەم :**

کۆمارە دیموکراتی‌یە گەلی‌یەکان کە لە ئەوروپاو ئاسیای رۆژهەلاتدا دامەزراوون • لەو ولاتانەدا ناونیشانی رەسمی دەوڵەت «دیکتاتۆری پرۆلیتاریایە » •

## ● کوسمۆپۆلیتیزم Cosmopolitisme

بەرامبەر بە « شوڤینیزم » تیوری‌و سیاسەتی « کوسموپولیتیزم »(۱) هەیە ، کە بە « جیهان نیشمان »ی ناو ئەبرێ • ئەم تیوری‌یە هیچ بایەخێك بە ڤازانجی نیشتمان‌و خەڵکی نەتەوەو فەرهەنگی نەتەوایەتیانەو مێژووی نەتەوەی خۆی نادات ، ئەمەش دیسان تیوری‌یەکی بۆرجوازی‌یانەی کۆنەپەرستانەیە • لەو زەمینەدا کەسایەتی نەتەوەو دەسەڵاتی نەتەوەو پێویستی راپەڕین لە پێناوی سەربەخۆیی‌و سەربەرزی نەتەوەدا بایەخی نیە • ئەوانەی بەمجۆرە بیر ئەکەنەوە داوای دەوڵەتێکی سەرتاسەری جیهان ئەکەن کە ئەوەش سەپاندنی ئیمپریالیزم بەسەر هەمو گەلانی جیهاندا ئەگرێتەوە •

لە وڵاتەکانی جیهانی سێیەم‌و ئەو وڵاتانەی تردا کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدان ، داخوازی سەربەخۆیی نەتەوەیی ئەوەندە بە هێزە کە کوسموپولیتیزمەکان ناتوانن‌و ناوێرن داکۆکی لەسەر ئەو تیوری‌یەی خۆیان بکەن • شوڤینیزم‌و کۆسمۆپۆلیتیزم هەردوکیان راپەڕینی دژی ئیمپریالیزم بە هەڵە ئەزانن ، مەترسی ئەخەنە بەر راپەڕینی نەتەوایەتیانەو ئازادیخوازانەوە •

## ● کولتـور Colture

بریتی‌یە لە کۆمەڵە بەهایەکی مادی‌و مەعنەوی کۆمەڵگای ئادەمیزاد ، کە لە ئەنجامی گۆڕینی کۆمەڵایەتی - مێژوویی پەیدا ئەبێت • کولتور ، هەمو چالاکی‌یە بونیاتنەرەکانی ئادەمیزاد ئەگرێتەوە ، وە هەمیشە دو لایەنی بە یەکەوە پەیوەندیداری هەمیشەیی هەیە ، وەکو :

---

(۱) Cosmopolitisme

١ ـ کولتوری مادی
٢ ـ کولتوری مەعنەوی

**کولتوری مادی :**

بریتی‌یە لە کۆمەڵە هۆیەکی بەرهەم هێنان ، تەکنیك ، تاقیکردنەوەی بەرهەم هێنان ، هـــەمو بەها مادی‌یەکانی تری کۆمەڵ لە هەر قۆناغێکی پێـگەیشتنی مێژوویی خۆیا بە خۆیەوە ئەگرێت •

**کولتوری مەعنەوی :**

کۆمەڵە دەسکەوتێـکی زانستی‌و هونەری‌و رەووشتی‌و فەلسەفەیی کۆمەڵە •

کولتور ، دیاردەیەکی مێژوویی‌یە کە پەیوەنـدی بە قۆناغەکانـی فرماسیونی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری کۆمەڵـگاوە هەیـە • بە پێنچەوانەی تیوری‌یە ئایدیالیستیەکان کە کولتوری مەعنەوی لە بناغەی مادی جیـــا ئەکەنەوەو بە بەرهەمێـکی دەروونی دائەنێن •

تیوری شۆرشگێڕانە ریبازی بەرهەم هێنانی نیعمەتی مادی بە پایەو سەرچاوەی گەشە کردنی کولتوری مەعنەوی دائەنێ‌و بە بەرهەمی کارو چالاکی‌و کرداری کۆمەڵانی زەحمەتکیش ئەزانێت • بە بێ پەیوەندی نێوان کولتوری مادی‌و کولتوری مەعنەوی ، کولتوری مەعنەوی خـۆی لە خۆیا توانای هیچ جۆرە گۆڕانێـکی نیە • چونکە سـەربەخۆیەکـی نیسبی‌و یاسای تایبەتی خۆی هەیە •

لە کۆمەڵـگای چینایەتیدا کولتور بریتی‌یە لە چەند خاسیەتێـکی چینایەتیانە ، هـــەر چینێـکی پێشـــکەوتو خاوەنـی کـولتورێـکی

پێشکەوتووانەیە ، لەگەل پەیدا بون و شان بەشانی گەشەکردنی هەر نەتەوەیەك کولتوری نەتەوایەتیانەش گەشە ئەکات •• لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا لەناو کولتوری نەتەوایەتیانەدا دو جۆر کولتوری مەعنەوی هەیە :

**یەکەم :**

کولتوری بۆرجوازی : تێشکدانەوەی قازانجی چینە چەوسێنەرەوەکانەو بایەخ بە هەمیشەیی مانەوەی ریژیمی سەرمایەداری ئەدات •• لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا چەندان عونسوری سەر بە کولتوری سوشیالیستی‌و دیموکراتی هەیەو پەیدا ئەبێت کە داکۆکی لەسەر قازانجی زەحمەتکێشان ئەکات ، پرۆلیتاریا خاوەنی پێشکەوتوانە ترین کولتوری مەعنەوی‌یەو ئەرکی داهێنانی کولتورێکی تازەی سوشیالیستیانەیان لە ئەستودایە • لەبەر ئەوە نابێ کولتوری کۆمەڵگای سەرمایەداری بە کولتوری بۆرجوازی بزانین •

**دووەم :**

کولتوری نوێی سوشیالیستی یانە : لەسەر تیوری شۆرشگێرانە پێك هاتووەو هۆیەکی کاریگەرانەی پەروەردەکردنی شۆرشگێرانەی زەحمەتکێشانە •

لە هەندێك نوسین‌دا وشەی « کولتور »[1] سێ مانای لەیەکتر جیاجیایان هەیە :

**یەکەم :**

بە مانای شارستانێتی ، هەڵس‌و کەوتی کۆمەڵگا ، بەهای پەیوەندی

(۱) Culture

کۆمەڵ لەگەل شارستانێتیدا • شۆرشی فەرهەنگی[۲] کە لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانا لە دوای شۆرشی سیاسیو کۆمەڵایەتی‌یەوە رو ئەدات ئەم مەفهومە ئەگرێتەوە •

**دووەم :**

بە مانا ئایدیۆلۆجی ، دەرخستنی پەیوەندی نێوان هەر مرۆڤێکو جیهان ، دابەشکردنی هەر فەرهەنگێک بە دو بەش :

١ ـ فەرهەنگی بۆرجوازی فەرمانڕەواو کونەپەرست

٢ ـ فەرهەنگی دیموکراتیو سوشیالیستی •• کە پەیوەندە بە کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشەوە • شۆرشی فەرهەنگی لەم کاتەدا بەو مانایەیە کە پێویستە فەرهەنگی ئایدیۆلۆجی بۆرجوازی جێگای خۆی بۆ فەرهەنگی سوشیالیستی چۆڵ بکات •

**سێیەم :**

بە مانای ئامۆژگاری یان زانست ، زانستە هونەری‌یەکان ، زانیاری گشتی ، لەم بوارەدا مەفهومی « نەبونی فەرهەنگ ، یان نەبوونی کولتور »وە یان بڵێین « بێ فەرهەنگی »بە مانای نەبونی زانیاری ، نەخوێندەواری ، نەزانینو شتی پڕوپوچ ئەگرێتەوە •

● **کاپیتۆلاسیون** Capitulation

لە روی مێژوویەوە ئەم زاراوەیە لە سەدەکانی دەیەم تا دوازدەیەمی زاینی پەیدا بووە ، بریتی بووە لە مافێکی تایبەتی کە لە « بیزانس »بەو شارە بازرگانی‌یە گەشە کردووانە ئەدرا لە ئیتالیا کە لە

---

(٢) لێرەدا فەرهەنگ مەبەست هەمان کولتوری سەرەوەیە •
**وەرگێر**

بواری بازرگانیدا پێشکەوتوو بون ، لەو سەدەیانەدا دەوڵەتی ناوچەیی ئەیتوانی بە پێی قازانجی خۆی ئەم مافە زیادو کەم پێ بکات وەیان قەدەغەی بکات •

لە دوای دامەزراندنی ئیمپەراتۆری عوسمانیەکان ئەم مافە بەو شارانە ئەدرا کە سەر بە ئیمپەراتۆریتی‌یەکە بون ، لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەیەمدا ئەم مافە لە لایەن عوسمانی‌یەکانەوە درا بە بازرگانە فەرەنسەییەکان • زانایان ئەمەیان بە ئیجازەی تایبەتی ئیمپەراتۆری‌یەکان لێک داوەتەوە ، کە لە لایەن بابی عالی « دەرباری عوسمانیەکان »ەوە ئەدرا بە وڵاتە ئەوروپاییەکان ، تاکو هیچ کەس رێگای مامەڵەو مامەڵە کاری‌یان لێ نەگرێت • خاسیەتێکی تایبەتی ئەم بڕیارنامەیە ئەوە بووە کە هەمیشە یەك لایەنە بوو • واتە تەنیا لەلایەن دەوڵەتێکەوە ئەدرا •

لە ناوەراستی سەدەی هەژدەیەمدا « کاپیتولاسیۆن » خاسیەتێکی تایبەتیانەی بە خۆوە گرت •• بەو مانایە کە لە لایەن دەوڵەتە گەورە ئەوروپاییە کانەوە ئەدرا بە کیشوەرەکانی رۆژ هەڵاتو ئیتر بە شێوەی یەك لایەنیانە رەت نەئەکرایەوە •

کاپیتولاسیۆن ،لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا لە ئیرانو چینو ژاپونو هەندێک وڵاتانی تری ئاسیاو ئەفەریقادا کاری پێ ئەکرا •• ریژیمی « کاپیتۆلاسیۆن » گەلێك

یارمەتی بە دەسەڵاتی سەرمایەو بازاڕی ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بە دواکەوتوویی مانەوەی ئەم وڵاتانەدا • قونصولگەری وڵاتە سەرمایە داری‌یەکان دەسەڵاتی ئیداریو پولیسیو یاسایی تایبەتی‌یان پێ درابو •

کاپیتۆلاسیۆن ، لەگەل مافی دەسەلاتداری‌و سەربەخۆیی خەلك‌دا جیاوازی‌یەکی ئاشکرای دیاری هەیە ، کە شۆرشی گەورەی سوشیالیستی سەرکەوت ـ لە زۆر شوێن‌دا ـ دەمودەس ریژیمی کاپیتۆلاسیۆنی بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئیستیعمار گەری دانراو قەدەغە کرا .

**کرێکاری کشتوکالی :** Peasants Farmers

یان پرۆلیتاریای کشتوکالی ، بریتی‌یە لە کرێکاری رۆژانە ، کە لە کێلگە کشتوکالی‌یەکانی سەرمایەدارەکانا کار ئەکەن ، زوربەی ئەم کرێکارانە ئەو جوتیارە سپایی‌یانەن(۱) کە زەوی‌و زاریان نیە ، وەیان ئەوەندەیان نیە بەشی گوزەرانی خۆیان بکات .. بۆ خۆ بەخێو کردن لە کێلگە کشتوکالی‌یە سەرمایەداری‌یەکانا بە رۆژانە کار ئەکەن .

لە ریژیمی سەرمایەداری‌دا کشتوکال کارەکان ، یان بلێین جوتیارەکان بەزۆری هەژارو دەسکورتن .. بەشێکی زۆریان ناچار ئەبنە کرێکاری کشتوکال .

کرێکارە کشتوکالی‌یەکان لە روی پەیوەندی‌یانەوە لەگەل هۆیەکانی بەرهەم هێنانداهیچ خاوەنداریتی یان خاوەن ملی‌یەتێکیان نیە ، بەلام لەروی هەندێك مەرجی تایبەتی‌یەوە کە ستەم‌و زۆریان لێ ئەکرێ چەوساوە ترین توێژی چینی کرێکارن . ئەو خاوەن سەرمایەی حوکمیان بەسەرا ئەکات‌و ئەیان چەوسێنێتەوە خاوەن زەوی‌و زارەکانن ، کە زوربەیان سەرمایەداری خاوەن زەوی‌وزارو مەکانیزەو

---

(۱) ئەو جوتیارانەن کەزەوی‌و زاریان نیە .

**وەرگیر**

بانق‌و دەزگاو دامەزراوە ئابوری‌یە هەمە جۆرەکان‌و خاوەن کومپانیاو کۆلاك‌و خاوەن پارەو سەرمایەداری لادێ‌و خاوەن رەعیەتەکانن .

لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا کە چەوساندنەوە نامێنێت‌و زەوی‌وزار ئەدرێت بە جوتیارەکان‌و کشتوکاڵ ئەبێتە دەزگایەکی هەرەوەز کارانەو توێژە جۆربەجۆرەکانی چینی سەرمایەدارو چەوسێنەرەوەکان لەناو ئەچن ، لەو کاتەدا کرێکاری کشتوکاڵیش بەو جۆرەی کە لە رابوردودا بووە نامێنێتەوە .

## ● کومونی سەرەتایی Komon

کومونی سەرەتایی ، یان کۆمەڵگای هاوبەشی سەرەتایی ، یەکەمین شێوەی بەرهەم هێنانە لە مێژوودا . لەو کۆمەڵگایەدا ملکداریتی دەستە کۆمەڵی هەبو ، لە سەرەتای پەیدابونی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا ، هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و کارکردن زۆر سەرەتایی‌و دەستە کۆمەڵی بون .

زەوی ، هۆیەکانی کار کردن ، شوێنی نیشتەجێی‌و ... ئەمانەو هەمو شتێکی تری پێویستی ئەو سەردەمە بە هاوبەشی هینی هەمو خەڵك بون . بەرهەم هێنان بە شێوەی دەستە کۆمەڵی‌و بە هۆیە سەرەتاییە کانی کارکردن ساز ئەبو ، وەکو راو کردن‌و کۆ کردنەوەی میوەو بەروبومی درەخت‌و ئەمجۆرە شتانە . هەمو بەروبومێکی کارکردن بە دەستە کۆمەڵی کۆ ئەکرایەوەو پێکەوە ئەخورا .. ملکداریتی هاوبەشی ئەو کاتە بریتی بو لە ملکداریتی دەستە کۆمەڵی بچوك‌و جیا جیا لە یەکتر . شان بەشانی ئەم ملکداریتی‌یە هاوبەشی‌یە ملکداریتی تاکە کەسیش هەبوو .

ئەم هۆیانەی بەرهەم هێنان بە هاوبەشی لە سەردەمی کۆمونی سەرەتاییدا لە ئەنجامی هۆشیاری خەڵکەوە نەبوە ، بەڵکو پێویستی‌یەکی بوونی کاری دەستە کۆمەڵی بووە لە شێوەیەکی زۆر سەرەتاییدا • چونکە لەو سەردەمەدا زۆر ستەم بوە تاکە کەسێك بەبێ هاریکاری دەستە کۆمەڵی بتوانێت کارێك بە ئەنجام بگەیەنێت یان ببێتە خاوەنی خۆراکێکی رۆژانە •• یان بتوانێت بەرپەرچی هێزە سروشتی‌یەکان بداتەوە • لەو کاتەدا ژیان‌و کاری دەستە کۆمەڵی‌و بەرگریکردن لە رووی سروشت دا بە دەستە کۆمەڵی نەبایە ئەنجام نەئەدرا •• لەو کاتەدا مرۆڤ هەرچەند هەوڵی دا بایەو خۆی ماندو کردبایە لە خۆراکی رۆژانەی خۆی زیاتر توانای هیچ پاشەکەوتەیەکی تری نەئەبو •

لەو سەردەمەدا ، ئەو سیستەمە کۆمەلایەتی یەی کە چەندان ملیۆن ساڵ دریژەی کیشا ، بە هیچ جۆر چەوساندنەوەو زۆر کردن لە ئارادا نەبو • لەبەر ئەوەی رادەی بەرهەم هێنان زۆر لاواز بو یەکسانی بۆ هەمو وەکو یەك بو •• چەوساندنەوەو دەست بە سەرا گرتن لە ئارادا نەبو •

بەرەبەرە هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و دابەشکردنی سروشتی‌یانەی کار هاتنە کایەوە ، واتە ئیش‌و کاربە پێی رەگەزەکانی نێرومێ دیاری کران •• یان بە پێی توانای گەنجی‌و پیری دابەشکران •• لە ئەنجامی گەشە کردنی ئابوری ـ بەو شێوە سەرەتاییەو ـ زۆر بونی ژمارەی خەڵك ، تیرەو خێڵ پەیدا بون •

لە سەرەتاوە ئەرکی بەرێوە بردنی کارو ژیان لە ستۆی ژناندابو کە پێیان ئەوت « ماتریار کال »واتە « مێ وەجاخی(١) » یان دایك

---

(١) مادەر شاهی

سالاری • دوای رۆژگارێـک پیاوان توانی‌یان ببنه خاوەنـی ئەرکـــی بەڕێوەبردنی کاروبار که ئەو قۆناغه به قۆناغی « پاتریـار کـال »واتـه « نێر وەجاخی »یان باوك سالاری(۲) ناو نراوه •

له دوا قۆناغی فرماسیۆنی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری کومونی سەرەتاییدا شان بەشانی گەشه کردنی ئاژەڵداریو کشتوکاڵ کـاری دابەشکردنـــی کاری کۆمەڵایەتیانه هاته کایەوه • ئاڵو گۆڕ له نێوان ئەندامانی خێڵو تیرەکانا داهات •

یەکەمین دابەشکردنی گەورەی کۆمەڵایەتی جیا بونەوەی هۆزو ئاژەڵدارەکان بو • دوای ئەوه هەر چەند هۆیەکانی بەرهەم هێنان پێشتر کەوتبایه ئەوەنده بەروبومی مادی زۆر تر ئەبو ، هۆیەکانی ژیان زیاتر ئـەبو ، تا گـەیشته ئەوه بیـر لـه پاشەکەوتو دەست گرتن بەســـەر بەروبومی رەنجی یەکێکی تردا بکرێتەوه • بەره بەره گەیشته ئەو رادەیه که بایەخ به مڵـکداریتی تاکه کەسی بدرێو روخســـاری کۆمـــەڵ بگۆڕدرێته سەر روخساری کۆمەڵـگایەکی چینایەتی • کاری تاکەکەسیو ئاڵوگۆڕ بوو به هۆی پەیدا بوونی مڵـکداریتی تاکه کەســی •• دوای ئەوەش چینەکـانو چەوساندنەوه هاتنـه کـــایەوه •• مڵکداریتی ئاڵو گۆڕی کۆمەڵـگای هاوبەشی سەرەتایی بەره بەره لەناو چو • شـێوەی بەرهەم هێنانی تازەی ـ کۆیله داری ـ کـه یەکەمیـــن فرماســـیۆنی چەوساندنەوه بوو پەیدا بو •

● **کولاك** Kulak

واته خاوەن دەسمایه ، بەو جوتیاره لادێ نشینانه ئەڵێن که زەویو

---

(۲) بەەر شاهی ـ پێ ئەڵێن ••

زاری تەواویان بە دەستەوەیە ، دەرامەتی رۆژانەی خۆی لە سەر ئەرکی چەوساندنەوەی هێزی کاری ئەمو ئەو بە هێز ئەکات • واتە کرێکارە کشتوکاڵی یەکان ئەچەو سێنێتەوە • ئەمانە جگە لە ئیش و کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری وەکو هەمو خاوەن پارەکانی تری لادێ خەریکی مامەڵەو مامەڵە کاری ئەبن وەکو « سوو » خواردن و زەوی بەکرێ دان و بەکرێ گرتن ،•• نیوەکاری ، بەکرێ دانی ئامێری کشتوکاڵ •• ئەمانە بە هۆی ئەمجۆرە کارانەیانەوە ئەبنە خاوەن پارەو دەسەڵاتداری دێ •• لەگەل ئەوەشدا ژمارەیان کەمە بەڵام رۆڵێکی گەورە لە بواری کشتوکاڵ و بەرهەم هێنان و مامەڵەو مامەڵە کاریدا ئەگێرن • ئەمانە وەکو خاوەن زەوی و زارە زۆرەکان و سەرمایەدارەکان زۆر بە بێ بەزەییانە کرێکارەکانی بەردەست خۆیان ئەچەوسێننەوە •• دیسان لە لایەکی تریشەوە ئەمانە لەگەل ئەو خاوەن زەوی و زارە زۆرانەو ئەو سەرمایەدارانەدا کە ئەیانەوێ جێگایان بگرنەوە ناکۆکی یان هەیەو هەمیشە مشت و مڕیانە •

● **کاپیتالیزم** Capitalisme

لە وشەی « کاپیتال »(١) لە زمانی ئینگلیزی داو بە مانای سەرمایە هاتوە ، سیستەمێکی ئابوری یە ، کە زوربەی بەشە ئابوری یەکان و سەرمایەی وڵات بە دەست چەند کەسانێک و ئەو دەزگاو دامەزراوانەوەیە کە دەوڵەتی نین • ئەو دەزگاو دامەزراوە ئابوری یانە بەربەرەکانێی چالاکی ئابوری یەکترو قازانجی زیاتر ئەکەن • رەووشتی سیاسی و ئابوری ئەم سیستەمە بە تەواوی لەگەل رەووشت و سیاسەتی سیستەمی

---

(١) Capital

سوشیالیستی‌دا ناگونجێت .. کاپیتالیزم بە مانای تەواو خاوەن سەرمایە گەورەکان ئەگرێتەوە .

### ● کونسرواتیزم Conservatisme

لە وشەی « کونسروا »ی[1] ئینگلیزی‌یەوە وەرگیراوە کە بە مانا «کۆنەپاریز » ـ محافظ ـ ئەگرێتەوە . بەو کەسانە ئەوترێ لە کۆمەڵو دەوڵەت‌دا رێزی هەمو یاساو نەریتێکی رابوردو ئەگرن‌و هەوڵی مانەوەی ئەدەن . ئەم رێبازە لە بواری سیاسەتی بەریتانیادا پایەو ریشەی بەهێزی هەیە . ناوی [ کۆنە پارێز ] ـ کونسرواتیو ـ لە ساڵی ١٨٣٠ ـ ١٨٤٠ لە بەریتانیا داهات .. لەو کاتەوە ئەم وشەیە جێگای تیوری‌یەکی مێژوویی گرتۆتەوە .. لە سیستەمی سیاسی بەریتانیادا حزبی کۆنە پارێز یەکێک بووە لە حزبە گەورە دەرکەوتوە کانی وڵات‌و گەلێک لە گەورەپیاوانی زانای ئەو وڵاتە کاریان تیا کردوە .

ئەم رێبازە ، هەرگیز شێوازێکی فەلسەفیانەی رێک‌و پێکی نەبوە بەڵکو ئەتوانین بەمجۆرەی خوارەوەی لێک بدەینەوە : [ هەمیشە روبەروی شۆرشگێرە توندرەوەکان وەستاوە ] .. ئەمە گەورە ترین سیفەتی ئەو رێکخراوەیە .

### ● کۆنفیدراسیۆن Confederation

بە یەکێتی نێوان چەند دەوڵەتێک ئەوترێت ، لە پێناوی هاریکاری‌و بەرگری کردن لە سەر یەکتر . بەڵام دەسەڵاتێکی ناوەندی‌یان نیە کە حوکم بەسەر دەوڵەتە ئەندامەکانی ناو کۆنفیدراسیۆنەکەدا بکات ، بەڵکو هەر دەوڵەتەبۆ خۆی لە کاروباری سیاسی ناو خوو دەرەوەی خۆیا ئازادو

---

(١) Conserve

سەر پشکە .. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لـە سـاڵەکانی ١٧٧٨ ـ ١٧٨٧ بەرلەوەی شێوازی فیدراسیۆن بە خۆوە بـگرێ کۆنفیدراسیۆنی بو .

ئەڵمان لە ساڵی ١٨١٥ تا ١٨٦١ و هۆڵەندە لە ساڵی ١٨٥٠ تا ١٧٩٥ ئەمانیش کۆنفیدراسیۆن بون . سویسرە ، ئەگەرچی بە رەسمی دەوڵەتێکی کۆنفیدراسیۆنە بەڵام لەواقیع دا دەوڵەتێـکی فیدراسیۆنی یە . ولاتانـی ئەندامی کۆنفیدراسیۆن لە بواری پەیوەندی نێو دەوڵەتانـدا هەروەکـو دەوڵەتێـکی سەربەخۆ ئەمێننەوە .. بەڵام شـەڕ لەنـاو خـۆیانا قەدەغـە ئەکەن .

● **لاتیفۆندیست** Latifundiste

بەو کەسانە ئەڵێن کە زەوی‌و زارێـکی کشتوکاڵی‌یان هەبێت ، ئەم وشەیە بە رەگـەز لاتینی‌یەو بە مانـا زەوی‌و زارێـکی فراوانـی تاکـە کەسێکە . ئەم زاراوەیە یەکەمجار لە سەردەمی کۆیلەیدا پەیـدا بـو . لاتیفۆندەکانی سەردەمی کۆیلـەداری یەکەمجـار لـە رۆمـی کـۆن دەرکەوتن . لاتیفۆندیستەکان لەو زەوی‌وزارە فراوانەیانا بە نرخێـکی هەرزان‌و رۆژانەیەکی کەم کاریان بە جوتیارەکان ئەکـرد . بەرەبـەرە خاوەن زەوی‌وزارە بچوکەکانیان لە کێڵـگەکانیـان ئەکـردە دەرەوەو زەویەکانیان داگیر ئەکردن .

لە پاش لەناو چونی سیستەمی کۆمەڵایەتی‌و ریژیمی کۆیلەداری جارێـکی تر دیسانەوە لاتیفۆندیسـتەکان لـە رۆژگـاری فیودالیزمـدا دەرکەوتنەوەو بونـەوە خـاوەن زەوی‌و زاری فراوانتـر . تەنانـەت ئیستاش[1] لە هەندێـک لە ولاتە سەرمایەداری‌یەکانا ماونەتەوە .

(١) کاتی نوسینی کتیبەکە **وەرگێر**

لاتیفۆندەکان لە هەندێـک ناوچەی خواروی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئیتالیاو بە تایبەتی لە کیشوەرە جۆربەجۆرەکانی ئەمەریکای لاتین‌دا ماونەتەوە •• لاتیفۆندیستەکان ماهیەتێـکی نیمچـە فیودالی‌یـان هەیە • هەندێـک کومپانیـای گـەورەی ئیمپریالیسـتی لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانا کە زەوی‌و زارێـکی زۆریان هەیە ـ بە تایبەتی لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی ئەمەریکای لاتین دا ـ ئەوانە بـە پێی ریژیمـی لاتیفۆندی بەریوە ئەبریـن • شتێـکی ئاشـکرایە لاتیفۆندیسـتەکان کۆنەپەرستانە ترین توێژی سەر بە داگیرکارانن •

## ● لومپن پرولیتاریا Lumpen Proletariat

ئەم زاراوەیە لە زوربەی باس‌و بابەتی کۆمـەڵایەتـی‌و سیاسـی‌دا ئەبینرێت • لە روی زمانەوە پرۆلیتاریای سەرگەردان ئەگرێتەوە ، بەڵام مەفهومی راستی‌و زانستی‌یانەی بەو کەس‌و توێژانە ئەڵێن کە لە چینـی خۆیان دور کەوتونەتەوە • لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا بە زۆری لـە شارە گەورە کانا ئەژین • ئەمانە هیچ پەیوەندی‌یەکی چینایەتیانەیان لەگەل چینەکەیانا نامێنێ ، لە ژیانێکی ناسروشتیانەدا ئەژین ، هیچ پیشەو کارێکی تایبەتی‌و ئاشکرایان نیە ، هیچ خزمەتێـکی کۆمەڵیان بێ ناکرێت ، لە هەمو هەل‌و مەرجێـکدا ژیانیان تاڵ‌و ئاڵۆزە •• زۆر جار ئەو کارانە ئەکەن کە مرۆڤ رەتی ئەکاتەوەو کاری ناپەسەندانە ئەکەن وەکو دزی ، چەقـۆ کەشی ، شەوکوتی ، خراپە کاری و •••

گەلێك لەم توێژانە لە کاتی خۆیا کرێـکار یان بۆرجوازی بچـوك بون ، بەڵام ریژیمی سەرمایەداری بە جۆرێك لێ‌ی داوون‌و کاری تـێ کردوون کە گیرۆدەی ئەو بارە ناهەمواری‌یە بـوون • ئەمانـە هیـچ

پەیوەندی‌یەکی چینایەتی‌یان نەماوە بە تایبەتی لەگەل چینی پرۆلیتاریادا •وە هیچ جۆرە پەیوەندی‌یەکی ئایدیۆلۆجی‌و هاریکاری‌یان لەگەل زەحمەتکێشانا نیە •

کۆنەپەرستانی سەرمایەدار زۆر جار بۆ مەبەستی کۆنە پەرستانەی خۆیان سود لەو عونسورانە وەر ئەگرن ، چونکە ئەوانە بە هەمو مانایەك دژی نەتەوەو دژی دیموکراتین • سەرمایە دارەکان ئەو کەسانە بە کرێ ئەگرن‌و ناشیرینترین کاریان پێ ئەسپێرن ، زۆر جار بۆ سەرکوتکردنی راپەرینی کۆمەلانی خەلك‌و بۆ پیلانگێرانو ئاژاوە نانەوە بەکاریان دێنن •

بۆرجوازی‌یەکان کۆمەلانی دەست وەشێنی فاشیستی‌یان لە ناوا دروست ئەکەن‌و بە کرێیان ئەگرن ، لە کاتی مانگرتنی کرێکاران‌و راپەرینی شۆرشگێرانەی خەلکا ئەیانکەن بە گژ کۆمەلانی خەلکدا • ئەوانە لە پێناوی پارەدا ئامادەن هەر کارێکی ناشیرین‌و نامرۆڤانە بە ئەنجام بگەیەنن •• تەنانەت کۆ لە کوشتنی پیاوی سیاسی‌و ئەمو ئەو ناکەنەوە •• کانگستریسمە سیاسی‌یەکان گەلێك سود لەوانە وەر ئەگرن •

بە کورتی لومپن پرۆلیتاریا چونکە لەباری ژیانەوە هەژارو دەسکورتن ، بە هۆی ئەوەوە کە خاسیەتی چینایەتی خۆیان دۆراندووە ئامادەن لە پێناوی دەرامەت‌و پارەدا هەر کارێك پێیان بسپێردرێ بیکەن ، هەر لەبەر ئەمەشە سەرمایەدارە کۆنە پەرستەکان بۆ قازانجی خۆیان بەکاریان دێنن •

رۆژگاری سەرمایەداری بە هۆی ئەو بێکاری‌یە درێژ خایەنەوە کە لە گەلیا یەتی ئەبێتە هۆی هەژاری خستنەوەو ئاوارە کردنی

زەحمەتکێشەکان ، کـە ئەمەش خۆی لـە خۆیدا ئەبێتـە سـەرچاوەی خولقاندنی لومپن پرۆلیتاریا • بەڵام نابێت وای دابنێین کە هەر کرێکارێك بێ ئیش بو ئیتر ئەوە ببێتە لومپن پرۆلیتاریا ، ئەگەرچیو هەرچەند ئەو بێـکاری‌یەشیان درێژە بکێشێ ••

لومپن پرۆلیتاریا ، تەنیا ئەو کەسانەن کە ماهیەتی پەیوەندی چینـی خۆیان دۆڕاندووە ، ئەم توێژانە لەگەل لەناوچونی ریژیمی سەرمایەداری دا ئەوانیش لەناو ئەچن •

## ● لیبرالیسم Liberalisme

ئەتوانین ئەم وشەیە بە ئازادیخواز لێـك بدەینـەوە چونکە لـە وشەی « لیبر » بە مانای ئازادەوە هاتووە ، لەبـەر بـاری سـەرنجی سیاسیانەدا دو مەفهومی جیاواز لە یەکتری هەیـە ، لـە مەفهومێـکی سیاسی‌دا بە کرداری سیاسیانەی بۆرجوازی ئەوترێ کە لە سەردەمی گەشە کردنیا ـ لە کاتێـکدا سەرمایەی سنعەتی دژی ئاریستوکراسی، فیودالی و لە پێناوی بە دەست هێنانی دەسـەلاتی بۆرجوازی‌یـەکان دا راپەری ـ هاتۆتە دیو گەشەی کردوە لیبرالەکان یان ئازادیخوازەکان لەو رۆژگارەدا پشتگیری یان لە چینێك ئەکرد کە لە کاتی گەشە کردنا بونو داوای ئازادی ئابوریو کۆمەلایەتی‌یان ئەکرد ، ئەیانویست سنور بۆ دەسەلاتی فەرمانڕەوا دابنرێ •• رێـگای لیبرالەکـان بدرێت بچنـە پارلمانەوە ، رێزی مافو هەمو بیرو رایەکیان لە پارلماندا بگیرێت •

مەفهومی سیاسی تری لیبرالیسم ، بە رەووشتێکی سیاسی بێ سنوری شێوە دەروێشـانە ئەوترێت لـە ناو رێـکخراوە کرێـکاری‌یەکاندا • • لەم کاتـەدا بە مانا ئاشتیخواز ئەگرێتەوە کـە زیان بە بنچینـەی بیری

شۆرشگێرانە ئەگەیەنێت • لیبرالیسم لـــەم حاڵـــەتەدا و بەم مەفهومـــە یەکێــکە لە دیاردەکانی ئەپورتۆنیسمو ئەندیفیدوالیسم •

● **مۆبۆکراسی** Mobocracy

بە مانا ئەو جۆرە دەوڵەتانە ئەگرێتەوە کە لە کەسـانی نـەزانو هەرچیو پەرچی پێـك دێن •• ئەمانەش بە زۆری لە کاتی گێژاوی سیاسی یان کۆمەڵایەتی هەر وڵاتێـکدا رو ئەدات کە سەرکردەکانـی ئەو دەوڵەتە کەسانی بازاڕیو لێ نەوەشاوەو هەرچیو پەرچی ئەبن • کاروباری وڵات ئەکەوێتە دەست کەسانی نەزانو لێ نەهاتووەوە •

ئەفلاتون زۆر رقی لە موبوکراسی[1] بووە •• هـەردۆت لـــە یەکێك لە نوسینەکانیا لە بارەی دیموکراتیەوە باسی موبوکراسی تیـا کردوە وتویە :

« **بۆیە حەز ناکەم دیموکراسی بێتە کایەوە ئەترسم لـــە ئەنجامی ئازادیو سەربەستی بێ سنوردا مەسەلەکـــە بـــە موبوکراسی بگۆڕدرێت** » •

● **ماك کارتیسم** Mccarthysme

ئەم وشـەیە لـــە ناوی ســـەناتۆری ئەمەریکایی « جوزیف مـــاك کارتی »یەوە وەرگیراوە ، ئەم سەناتۆرە کۆنە پەرستە ئەمەریکاییـە نوێنەرایەتی هارترین کۆمەڵی ئیمپریالیستیو جەنگی ساردو سەرۆکـی کۆمیسیۆنی لقی لێـکۆڵینەوەی تۆرگانە دەوڵەتییەکانی ئەمەریکایی کە لە ساڵی ۱۹۵۱ دامەزرا گرتبویە ئەستۆی خۆی •لە ژێر ناونیشانی «چالاکی

---

(۱) Mobocracy

نواندن دژی ئەمەریکایی » سودی لە دڕندە ترین شێوازی ئازاردانو سەرکوتکردنی ئازادیخوازانو لێدانی رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکان وەر ئەگرت •

ماك کارتیسم ، بە کرداری هەڕەشە کردنو کوشتنو رفاندنو بوختان سازدانو فایل دروستکردن ئەڵێن لە پێناوی سەرکوتکردنی تاکە کەسو کۆمەڵو رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکاندا •

ماك کارتیسم ،رواڵەتی کرداری بە فاشیستی کردنی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی‌یە ، بەو کەسانە ئەڵێن کە هەمیشە هەوڵ ئەدەن مافی دیموکراتیو ئازادی‌یە دیموکراتیەکان بخنکێنن •

## ● ماکیافیلیسم Machiavelisme

ئەم زاراوەیە لە ناوی « ماکیافیل(١) » نووسەرو سیاسەتزانی ئیتالیایی وەر گیراوە ، کە لە کۆتایی سەدەی پازدەیەمو سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا ژیاوە • ئەو ئامۆژگاری دەسەڵاتدارانی ئیتالیای کردوە کە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجی خۆیانا کۆ لە هیچ خراپەکاری یەك نەکەنەوە •• وشەی ماکیافیلیسم بە مانای ئەو سیاسەتو رەووشتەیە کە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجدا لە هیچ شتێك لانەداتو هەمو رێزێکی ئەخلاقیو مرۆڤایەتیو رێزو گەورەیی بکات بەژێر پێوە •

بە واتایەکی تر ماکیافیلیسم مانای پشت گوێ خستنی هەمو یاساو نەریتو عورفو عادەتێکی کۆمەڵو پێ شێل کردنی وێژدانو راستیو دادپەروەری یە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجدا •

---

(١) Machiavele

● **مالتـۆسـیانیسم** Maltusianisme

ئەم وشەیە لە ناوی قەشەی ئینگلیزی « مالتوس »ەوە وەرگیراوە ، کە لە کۆتایی سەدەی هەژردەیەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ژیاوە .. تیوری یەکەی تیوری‌یەکی بۆرجوازیانەی زۆر کۆنەپەستانەیە،ئەو وتویە کۆمەڵگای ئادەمیزاد زیاد لە رادەی گەشە کردنی کەرەسەی خۆراك گەشە ئەکاتو زۆر ئەبێت ئەمەش ئەو ئەنجامە هەڵەیە ئەدات بە دەستەوە کـە کۆمەڵانی خەڵك دوچاری مەترسی برسێتی‌و هەژاری ئەبـن . وە بەڵـگەی ئەمەیە گوایە زاوو زێ کردنی زۆر ئەبێتە هۆی دەسـکورتی‌و برسێتی .

ئەوانەی لایەنگری تیوری‌یەکانی « مالتوسـ »ن چاویـان ریژیمـی کۆمەڵایەتی تازەو هۆیەکانی بەرهەم هێنان نابینێتو باوەڕیان بـە رۆڵی گرنگی زانستو تەکنیكو دەسکەوتەکانیان نیە .

تیوری زانەکان ، بە زۆری بەرپەرچـی ئـەم تیـوری‌یە کۆنـە پەرستانەیانە داوەتەوە .

لەم رۆژگارەی دوایدا(۱) ، هەندێـك لە کۆمـەڵ شوناسانـی ئەمەریکایی‌و ئینگلیزی هەوڵی ئەوەیان داوە ئەم تیوری‌یە زیندو بکەنەوەو بە تیوری « نیۆ مالتۆسیانیسم » سیاسـەتی ژێر دەسـتەکاری دەوڵـەتە ئیمپریالیسـتیەکان بەهێز بکەن . ئەوانە تەنانەت جەنگە تالانکاری‌یەکان بە هۆیەك لە پێناوی چارەسەر کردنی باری گوزەرانو پێشخستنی باری ئابوری‌و کۆمەڵایەتی دائەنێن ، چونکە خەڵکێـکی زۆر لە ناو ئەچـن‌و بە پێی باری سەرنجی ئەوان ئیتر باری گوزەران خۆش ئەبێت .

---

(۱) بە نیسبەت سەردەمی دانانی کتێبەکەوە . **ـ وەرگیر ـ**

ئەم تیوری‌یە ماهیەتێکی کۆنەپەرستانەو دژی مرۆڤایەتی هەیە •
لە راستیدا هەژاری‌و دەسکورتی زەحمەتکێشان لە ریژیمی سەرمایە داری‌دا ، بە هۆی جەنگی ئیمپریالیستیانەو داگیر کردنی وڵاتان‌و شەڕی نارەواوە ڕو ئەدات •• ئەوانەی تیوری مالتوس پەسەند ئەکەن قسەکانیان بێ بناغەیەو هیچ بنچینەیەکی زانستیانەیان نیە •

تاقیکردنەوەی مێژوویی‌و زۆر بونی خەڵك شان بەشانی بە پەلە چاك بونی باری ژیان‌و گوزەرانی خەڵك لە وڵاتە پێشکەوتوەکانا پوچەڵی ئەمجۆرە تیوری‌یانە ئەسەلمێنێ •

## ● مانیفێست Manifeste

ئەم وشەیە کە بە مانای راگەیاندراو ، پەیام ، باری سەرنج‌و ••• لێك دراوەتەوە چەند مەفهومێکی جۆربەجۆری هەیە ، بەهادار ترین مەفهومیان پەیامی درێژو دەرخستنی شێوازی بیرو باوەڕ ئەگرێتەوە ، کە لە لایەن دەزگا یان رێکخراوێکی سیاسی یان چەند ناودارو رێکخراوی ئەدەبی‌و هونەری‌یەوە بلاو بکرێتەوە •

لە هەر مانیفێستێکدا مەرام‌و بەرنامەی کار کردن‌و نەخشەو پێشنیاری هەمە جۆرە نیشان ئەدرێت •
زۆر جار مانیفێست لە لایەن کۆمەلێك هونەرمەند یان نوسەرەوە بلاو ئەکرێتەوە ، کە رازو نیازو مەرام‌و ویستی ئەو دەستەو کۆمەڵەی‌ا تیا بەدیار ئەکەوێت • زۆر جار دەولەتێك یان رێکخراوێك نیازو نەخشەکانی خۆی بەناوی مانیفێستەوە نیشان ئەدات •• لە کاتی هەڵبژاردنیشدا بە زۆری مانیفێستی هەڵبژاردن بلاو ئەکرێتەوە • لە زۆر کاتیشدا وشەی مانیفێست بە مانای نوسراوێکی سیاسی یان

بەڵگەی پێ ڕاگەیاندن کە ئامانجی مەسەلەیەکی تایبەتـی بێـت لەنـاو خەڵـکا بڵاو بکرێتەوە ئەگەیەنێت •

## ● مەتروپـۆل Metropole

بە وڵاتە ئیمپریالیستی‌یە خاوەن موستەعمەرەکان ئەڵێن •• دەزگا ئینحیساری‌یە گەورەکانی کیشوەرە مەتروپۆلی‌یەکان بەهێزی دارایی‌و سنعەتی خۆیان سودێـکی زۆر لە تاڵانکردنی ناوچە ژێر دەستەکانیـان وەر ئەگرن ، وەکو ئیشکردنی هەرزان بە خەڵـکی وڵاتە ژێر دەستەکان ، زۆری سەرچاوە سروشـتی‌یەکان‌و هەرزان بونی نرخی کەرەسـتەی خاو ، خستنە کاری دەست مایەو پارە لە وڵاتە ژێر دەستەیەکانا •

بەم هۆیانەی سەرەوە وڵاتە مەتروپۆلی‌یەکان سودێـکی زۆریـان پێ ئەگات ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە بە ئاشکرا خـەڵك‌و سامانی خەڵك لەو وڵاتە ژێر دەستەیانەدا تاڵان ئەکەن ، کیشوەرە ژێر دەستەیەکان ئەکـەنە کێڵـگەو کانـی کەرەستەی خاوی خۆیان •

## ● میـلی کردن Nationalisation

میلی کردن بەوە ئەڵێن زەوی ، بانقەکان ، هۆیەکانـی بارکردن‌و گواستنەوە ، کارخانەکان ، دەزگاو دامەزراوە جۆربەجۆرەکان ، دەزگا بازرگانی‌یەکان •• و هەمو هۆیەکانی بەرهەم هێنان لە ملـکداریتی تاکە کەسی یان کومپانیاو دەزگا تایبەتیەکان دەر بهێنرێن‌و هەمو بنە ملـکی دەوڵەت •

بەم پێ‌یە مەفهومی میلی کردن بریتی‌یە لە ڕەتکـردنەوەو لـەناو بردنی یاسای ملـکداریتی تایبەتـی‌و کومپانیـا تایبەتیەکـان لەنـاوەوەو

دەرەوە ، کە ئەو کومپانیاو خاوەن دەزگایانە لە کارخانەو دەزگاکانی خۆیانا خەڵکی تیا ئەچەوسێننەوە .. کاتێک باسی میلی کردن ئەکەین واتا رزگاربون لەدەست کومپانیاکانی بێگانەو کردنی کومپانیاکان بە مڵکی دەوڵەت .. کاتێک ئەڵێن میلی کردنی بازرگانی دەرەوە واتە هەمو مامەڵەو مامەڵەکاری‌یەکی بازرگانی دەرەوە بە دەستی دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت بسپێردرێت .

لە دوای لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی وشەی میلی کردن دێینە سەر باسکردنی ماهیەت‌و سروشتی میلی کردن .. لە کاتێکدا کە دەوڵەت خۆی خاوەنی خەصڵەتی چینایەتیانە بێت ، یان لە هەر کۆمەڵگایەکی چینا یەتیانەدا ناتوانین مەسەلەی میلی کردن لە دەرەوەی سروشتی چینایەتی دەوڵەت رەچاو بکەین .

بەمجۆرە ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە مەسەلەی میلی کردن تەنیا مەسەلەیەکی ئابوری نیە بەڵکو بەشێکی گرنگیشە لە مەسەلە سیاسی‌یەکانی وڵات .

لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا مەسەلەی « میلی کردن »ی دەزگاو دامەزراوەکان هێشتا ئەو مانایە بە خۆوە نەگرتووە کە دەزگاو دامەزراوە میلی کراوەکان ئەبنە مڵکی گەل ، لەبەر ئەوەیە چونکە دەوڵەت لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا دەوڵەتی تەواوی خەڵك نیە . لە وڵاتە سەرمایەداری‌یە کانا میلی کردن هەمو کەلین‌و قوژبنەکانی چەوساندنەوە بنەبڕ ناکات‌و هۆی تازەی بەرهەم هێنان‌و شێوەو روخساری تازەی بەرهەم هێنان ناهێنێتە دی .

میلی کردن هەندێك جار ئەبێتە هۆی سنورکێشان بە دەوری

دەسەڵاتی خاوەن دەزگـا ئینحیســـاری‌یەکانـاو هەندێـك جاریشـــ روخساری سەرمایەداری دەوڵەت بەهێز ئەکات •• چـەند نمونەیـەك هەیە کە سەرمایەدارەکان لە بارەی میلی کردنـەوە بەکاری دێنـن بـۆ فرۆشتنی کارخانەو چەرخو ماشینی کۆنی دەزگاو دامەزراوەکانی خۆیانو تازە کردنەوەی هەمو ئەمانە لە ســـەر ئەرکی دەوڵـەتو بۆدیجـەی گشتی ••

لە کاتی دەسەڵاتی کۆمەڵانی خەڵكو راپەڕینی زەحمەتکێـــشانا میلی کردن بە پێی ویستو داخوازی‌یە بنچینەیەکانی خەڵك دەسەڵاتی سەرمایەداران دیاری ئەکاتو سنوریان بۆ ئەکێشێت • وەکو میلی کردنی هەندێـك دەزگاو دامەزراو لە فەرەنسە لە دوای ئازاد بون لە ژێر نیری فاشیستیو سەرکەوتنی بەسەر هیتلەریەکانا •

لەم رۆژگارەی ئیستادا ، لە وڵاتە سەرمایـەداری‌یەکـانا دەزگـا ئینحیساری‌یە ســـەرمایەداری‌یەکـان دوژمنـی هـەرە گـەورەی چینی کرێکارانو تەنانەت دوژمنایەتی جوتیاران ، پیشە کاران ، ســەرمایەدارە بچوکەکان ، زوربەی کاربەدەستانو رۆشـنبیرانو تەنانـەت هەندێـك ســەرمایەداری مام ناوەندیش ئەکەن •• کرێـکاران دەســـتی تونـدی خۆیان لە دەزگا ئینحیساری‌یەکانی سەرمایـەداران ئەوشـێنن‌و هەمـو توێژەکانی کۆمەڵ کـە لە ناو چونی سەرمایەداری بە قازانجـی خۆیـان ئەزانن لە دەوری خۆیان کۆ ئەکەنەوە •• پرۆلیتاریا ئەو جۆرە میلـــی کردنەی ئەوێت کە بە قازانجی تێـکڕای کۆمەڵانی خەڵك بێت ، وە ئەمە بەشێـکە لە بەرنامەی کاری پرۆلیتاریا دژی سەرمایەداران •

میلی کردن لەو وڵاتانەی لە کاتی گەشە کردندان ئەهمیەتێـکی

تایبەتی ژیانی هەیە ، میلی کردنی دەزگاو دامەزراوە ئینحیساری‌یەکانی سەر بە دەرەوە پایەی بنچینەیی دەست بەسەراگرتنی بازرگانی دەرەوە ئەڕوخێنێت‌و دەستەبەری سەربەخۆیی ئەکات . کەوابو میلی کردن کارێکی گورچکبڕانەی دژ بە ئیمپریالیزمە .. کە ڕێگای گەشە کردنی ئابوری دوا کەوتوی وڵاتە ژێر دەستەکان ئەکاتەوەو دەرگای سەربەخۆیی ئابوری بۆ هەمویان ئەخاتە سەر گازی پشت .

لە سەردەمی ئەمرۆماندا ، سەردەمی گۆڕینی سەرمایەداری بە سوشیالیستی ، لەو سەردەمەدا کە ڕاپەڕین لە پێناوی گەشە کردنی ئابوری نەتەوایەتیانەو سەربەخۆ کردنی ئابوری وڵات‌و ڕاپەڕین لە دژی مونۆپۆلەکان ڕوڵێکی گرنگ دیاری ئەکات ، هەر لەو کاتەدا مەسەلەی میلی کردن ئەهمیەتێکی تایبەتی خۆی هەیە .. لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا چ پێشکەوتو بن یان لە حاڵەتی گەشە کردندا بن ، ئەم مەسەلەیە بە تەواوی لەگەل مەسەلە کۆمەڵایەتی‌کانی خەڵکدا تێکەڵە .

لە وڵاتە سەرمایەداری‌یەکانا دەوڵەت هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدات سەرچاوە دەوڵەتی‌یەکان لە پێناوی خزمەت بە سەرمایەداران‌و بەر لە هەمویان خزمەتی دەزگا ئینحیساری‌یەکانی پێ بکات .

● **میلیتاریسم** Militarisme

بریتی‌یە لە سیاسەتی دەوڵەتە سەرمایەداری‌یەکان ، کە لە سەر توندو تیژی‌و حوکمی ئەسکەری بەڕێوە بڕوات .. سود وەر گرتن لە هێزی سەربازی لەناو کاروباری سیاسی‌و خۆرێکخستنی شەڕی داگیرکارانە ، لە ئەنجامی کرداری ملیتاریستانەدا کار ئەگاتە ئەو ڕادەیە

کۆنەپەرست ترین‌و دەست درێژکار تریـن عونســـوری ســـەرمایەی ئینحیساری دەست بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی وڵاتدا بگرێ •

لەروی بەرهەم هێنانەوە ، ئەگەر دەستی میلیتاریستانە بکەوێتە ناو شێوازی بەرهەم هێنانی چەك‌و قۆرخانەی جەنگی‌یەوە ئـەوا بـە رادەی پێشکەوتنی بەرهەم هێنانی کەرەسەی جەنگی ئەوەندە بەرهەم هێنانـــی کەلوپەلە سنعەتی‌یەکانی تر کەم ئەبێتەوە ، تەنانەت زۆر جار ئەکەوێتـە مەترسی بە یەکجاری لەناو چونەوە • لە ئەنجامی بە سەربازی کردنی ئابوری ، باری گوزەران‌و ژیانی زەحمەتکێشەکان ناخۆش ئـەبێت •• چونکە زوربەی سەرچاوە دەرامەتی‌یەکانی وڵات بۆ کەرەسەی جەنگی‌و چەك‌و جبەخانە تەرخان ئەکرێت ، ژمارەیەکی کەمیان بۆ جێبەجێ کردنی بواری ئاوەدانی‌و کۆمەڵایەتی ئەمێنێتەوە • کرێی رۆژانە کەم ئەبێتەوەو توانای کڕین زۆر لاواز ئەبێت •• سەرمایەدارەکان بۆ زیاتر چەسپاندنی حوکمی خۆیان‌و لەناوبردنی ناکۆکی کارەکانیان زۆر جار پەنا ئەبەنـە بەر میلیتاریزم ، بەڵام ئەم کردارە ئەبێتە هۆی زیاتر توندو تیژ کردنـی ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵ‌و هێنانەدی ناکۆکی تازە لە مناڵدانی ریژیمـی سەرمایەداری‌دا • ئەم سیاسەتە شـان بە شــانی دەســـەڵاتی دەزگـا ئینحیساری‌یەکان‌و هەوڵ‌و تەقەللا دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان دژی وڵاتانی سوشالیست‌و راپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلی فراوان ئەبێت •

سەرمایەدارە ئینحیساری‌یەکان دەوڵەتی میلیتاریستی بە شێوەیەکی بێ وێنە بەهێز ئەکەن • میلیتاریسم کە ئەبێتە هۆی زۆر بونـی سـامانی کۆمەڵە تایبەتیە بۆرجوازی‌یەکان لە هەمان کـاتا ماڵوێرانـی‌و گرانـی‌و ئاڵۆزی دارایی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دروسـت ئەکـات‌و جیهانـــی ئادەمیزاد لە بەردەم شەڕێـکی گەورەی گیانسوتێنەرانەدا را ئەگرێت •

راپەڕینی زەحمەتکێشان لە دژی میلیتاریسمو مەخارجی جەنگیو دەستێوەردانی سەربازی بۆ ناو کاروباری ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەشێکە لەو راپەڕینە گشتییەی کە لە سەرتاسەری وڵاتە راپەڕیوەکانا دژی دەزگا ئینحیساری‌یەکانو داگیرکاران ئەکرێت لە پێناوی ژیانی ئاشتیو سەقامگیر بونی سوشیالیزم دا •

● **نازیزم** ـ بە ئەڵەمانی ناتسیزم ـ Nazism

زاراوەیەکە ، بە زۆری بەو تیوریو شێوەی حکومەتی ئەڵەمانیان ئەووت لە رۆژگاری ئادۆلف هیتلەردا ، هەندێك جاریشس بەو ریژیمانەیان ئەووت کە لە فاشیستیەتی ئەڵەمان ئەچون • وشەی نازی(١) ناو نیشانی کورتکراوەی « حزبی ناسیۆنال سوشیالیستی کرێکارانی ئەڵەمان »ە •

Nationalsozialis Tische Deutsche Arbeiterpartei

ئەم حزبە کە لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دامەزرا لە سالی ١٩٣٣ ـ ١٩٤٥ حوکمی سەرتاسەری وڵاتی ئەڵەمانی ئەکرد •

بنچینەی تیوری ئەم حزبە لە فاشیستی‌یەتی ئیتالیاو بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی‌یانەی کۆنی ئەڵەمانو چەندان تیوری رەگەز پەرستانەو یاساو نەریتی میلیتاریستی پروسی پێك هاتبو • بەرنامەی کاریان ئەوە بوو ئەڵەمانێکی میلیتاریستی بە دەسەڵات پێك بێنن کە بتوانێت سنورەکانی خۆی فراوان بکاتو یەکێتی ئەڵەمانی زمانەکان دابمەزرێنێتو دابینی بکات •• رەووشتی حکومەتەکەی توندو تیژ ترین جۆری دیکتاتۆریو توتالیتریزم بو • سودێکی زۆری لە پروپاگەندەو کاری زۆرەملی ئەکرد • « حزبی ناسیۆنال سوشیالیستی کرێکارانی

---

(١) *Nazi*

ئەڵەمان »کە لە دوایدا ناونیشانی کورت کراوەکەی « نازی » بو لە ساڵی ١٩٢٠ لە میونیخ دامەزرا، ئادۆلف هیتلەر کە رابەرو سەرکردەی حزبەکە بو لە ساڵی ١٩٢٣ لە پاش کودتایەکی لەناکاو دەسگیر کراو، خرایە بەندیخانەوە • لە زینداندا کتێبی « شەری من »ی دانا ، کە لە دوایدا بو بە کتێبێکی گرنگو پەیرەوی ناوخۆی نازییەکان •

نازیزم ، راپەرینێك بو بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی دەسەڵاتو هەیبەتی ئەڵەمانو لەناوبردنو سرینەوەی شوێنەواری تێکشکانی ئەڵەمان لە یەکەمین شەری جیهانیدا • ژمارەیەکی زۆر سەربازو ئەفسەرو چینە ناوەندییەکانو هەندێك لە سەرمایەدارانو خاوەن بانقەکان کە لە سوشیالیزم ئەترسان ، ئەمانەی هەمو لە دەوری خۆی کۆ کردەوە • دروشمی ناسیۆنالیستە نازییەکان تێکشکانی ئەڵەمانی لە شەری یەکەمدا خستە ئەستۆی ، مارکسیستەکان ، لیبرال دیموکراتەکان ، کاتولیکەکان •• بە تایبەتی جولەکەکان •

حزبی نازی تاساڵی ١٩٣٠ هیچ جۆرە ئەهمیەتێکی نەبو ، بەڵام لە دوای گێژاوی ئابوری بە پەلە گەشەی کرد ، بو بە گەورەترینو کوێرانە ترین هێزی سیاسی ئەڵەمان • دوای ئەوە « هیندنبورگ » سەرکۆماری ئەڵەمان لە ساڵی ١٩٣٣ دا هیتلەری کرد بە سەرك وەزیران •• هیتلەر لە ماوەی چەند مانگێك دا تەواوی حزبە سیاسییەکانی تری ئەڵەمانیای قەدەغە کردو حزبی « نازی » بو بە یەکەمین حزبی سیاسی ئەڵەمانیا • رەخنە گرتن بە تەواوی لە ئارادا نەما ، ئەوانەی سەرپێچی یان ئەکرد بە زۆر ئەیان ناردن بۆ ناو هوردوگا زۆرەملییەکانی کار پێکردن ، وە یان دور ئەخرانەوە • تیورییەکانی نازی کاری یان پێ ئەکرا •

سیاسەتی فراوانخوازی نازی‌یەکان بو بە هـۆی هەڵـگیرساندنـی دوەمین شەڕی جیهانی‌و حکومەتی نازی لە سـاڵی ١٩٤٥ دا ئەڵـەمانیای دۆڕاندو گەلێـك لە سەرکردەکانی حزب‌و دەوڵەت بە نـاوی تاوانبـاری جەنگ‌و دژی ئادەمیزادەوەو دران بە دادگا لە نورمبرگ •

بنچینەی فەلسەفەی نازیزم لە چەند تیوری‌یەك پێك هاتوە کـە لە ماوەیەکی کەمدا یەکانگیر بون • لە واقیع دا گەشە کردنێـکی سیاسی مێژوویی نەبو •• گرنگترین شێوازی نازی‌یەکان کە لە فاشیزمی ئیتالیـا ئەچو تیوری رەگەز پەرستانە بو کـە بە پێی ئـەو تیـوری‌یە رەگـەزی ئەڵەمان ئەبێت بە سەر هەمو رەگەزەکانی تری جیهاندا حوکمڕەوا بێت • وە هیتلەر ئەم تیوری‌یەی بە یاسایەکی نوێی جیهانی دائەنا • حزبـی سوشیالیستی ئەڵەمان لە واقیع دا نە ناسیۆنالیسـت بو نە سوشیالیسـت •• چونکە لە لایەنی یەکەمەوە بڕوای بە سەرکەوتنی یەك رەگەز بو نـەك نەتەوەکان • لە لایەنی دووەمیشەوە هەرگیز هیچ جۆرە سنعەتیکی میلـی نەکرد ، بەڵـکوتەنیا دەسکاری کاروباری ئابـوری ئەکـرد لـە بـواری پێداویستی‌یەکانی جەنگ‌و لەشکرا • ئایدیۆلۆجی نازی دەوڵـەت بـە دەسەلاتێـك دائەنێ کـە رێـگای رەخنە گرتنی خەڵـکی لێ گیرابێت • لەبەر ئەوە دیموکراتی‌و لیبرالیسیمی دور ئەخستەوەو ئارەزوی خەڵـکی بە بەشێك لە ئارەزوی دەوڵەت دائەنا •

نازیزم قارەمان پەرستی ئەکردو بە شان‌و باڵی دەسەلات‌و جەنگـی سەرکەوتوانەدا هەڵی ئەدا ، پەیوەندی‌یەکانی کۆمەڵـگای ئادەمیزادی بە بەشێـك لە یاسای « تەنازوعی بەقا »ئەزانی‌و ئاشتی درێژ خایەنـی بـە دواکەوتن‌و نابوتی دائەنا •• نازیزم باوەڕی بە ناکۆکی چینایەتی نەبو وە دوژمنی هەمو بیروباوەڕێـکی پیشکەوتنخوازانە بوو •

## ● ناسیونالیزم Nationalisme

له وشەی «ناسیۆن» كه به مانا نەتـەوه ئەگرێتـەوه وەرگیـراوه ، مەفهومی نەتەوه پەرستی یەكی كوێرانه ئەگـەیەنێت ، نابێـت ئەمـه بـه نیشتمان پەرستیو داكۆكی لەسەر مافی نەتەوه حیساب بكەین • لـــەم مەفهومەدا ناسیۆنالیسم یەكێـكه له شـێوازی ئایدیۆلۆجـیو سیاســەتی بۆرجوازی • ناوەڕۆكەكەی بریتی‌یه له نەتەوەی خۆ بەزل زانینو بـــه سوك تەماشا كردنی تەواوی نەتەوەكانی تر •

ناسیۆنالیسم له كاتی پەیدا بونی نەتەوەدا له كۆمەڵگای بۆرجوازی‌دا پەیدا بووەو لەگەل گەشـه كردنـــی سەرمایەداری‌دایـــه •• ئـــەم ئایدیۆلۆجی‌یه له كاتی سەر بەرز كردنەوەی سەرمایەداریو راپەڕیـن دژی فیودالیزم رۆڵێـكی گەورەی دیاری كردوه ، له بارەی هۆشیاری نەتەوەیيو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییەوه دەورێـكی كاریگەرانـەی هەبووه •

### ناسیۆنالیسم دو روخسار نیشان ئەدات :

**یەكەم :**

لای نەتەوه ئازادو دەسەڵاتدارەكان وەكو شوڤێنیسم كه تەنیـــا نەتەوەی خۆیان به باش ئەزانن‌و له پێش هەمو نەتەوەیەكەوه دای ئەنێن‌و مافی هەمو نـەتەوەكانی تـر رەت ئەكەنـەوەو ئەیانـەوێ نەتەوەكانی تر له ناو خۆیانا بتوێننەوه ، سەیر ئەكرێت •

**دووەم :**

لای ئەو نەتەوانەش كه ژێر دەستەن وەكو ناسیۆنالیسمی ناوچەیی كه پشت به كەسی تر نابەستن‌و تەنیا خۆیان به نەتەوه دائەنێـن‌و ئارەزویان جیا بونەوەیه •• تەماشا ئەكرێن •

بلوێر ژەنەکانی بۆرجوازیو ریفۆرمیستەکان هەوڵ ئەدەن بە ناوی « قازانجی گشتی نەتەوە »و هاندانی ناسیۆنالیسمو بانگەوازی نەتەوە پەرستی کوێرانەو جیا خوازی‌یەوە هوشیاری چینایەتی زەحمەتکێشان کەم بکەنەوەو کەلەبەر بخەنە ناو راپەڕینی جەماوەری خەڵکەوەو سەرنجی خەڵك بەرەو شەڕی ئیستیعماریو داگیر کارانە رابکێشن ..
ناسیۆنالیسم لەگەل قازانجی زەحمەتکێشانو بەرژەوەندی واقیعی نەتەوەدا ناگونجێت .

لە کۆمەڵگای سوشیالیستی‌دا ، کاتێك کە یەکسانی تەواو لە نێوان نەتەوەکانا ئەچەسپێ ، هەمو زەمینەکانی کۆمەڵایەتی و ئابوری ناسیۆنالیسم لە ئارادا نامێنێ ، بەڵام رواڵەتێکی لاواز وەکو پاشماوەی ریژێمیکی کۆنی سەرمایەداری لە ناو بیرو کرداری هەندێك کەسانا ئەمێنێتەوە چونکە کاریگەرێتی دەوری ناسیونالیسم لەناو کۆمەلانی خەڵك دا بە ئاسانی لەناو ناچێت .

تیوری شۆرشگێرانە هەمیشە شێوازی ئەنتەر ناسیۆنالیستی پرۆلیتاری بەرامبەر ناسیۆنالیسم داناوە . چونکە زەحمەتکێشان لە رێگای جێبەجێ کردنی یەکێتی سیاسەتو ئایدیۆلۆجی ئەنتەرناسیۆنالیستی پرۆلیتاری‌یەوە ئەتوانن لە نیری چەوساندنەوە رزگار بن .

دەزگا ئیمپریالیستیەکان هەمیشە هانی ناسیۆنالیستی کۆنەپەرستانە ئەدەن لە وڵاتە گەشە کردووەکانا ، بۆ ئەوەی ناکۆکی لە نێوان نەتەوەکانا بنێنەوەو ئەو ناکۆکیانە بکەنە گورزی دەستیان بۆ لێدانی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلیو سەرکوتکردنی رێبازی هێزە شۆرشگێرەکان .

ناسیۆنالیسم ، روخسارێکی ئاندیڤیدوالیسمانەی خۆ پەرستانەیە کە

پەیوەندی بە بۆرجوازیو وردە بۆرجواوە هەیە .. کە پرپەتی لە خۆ بایی بونو بە کەمی سەیر کردنی کەسانی تر .

● **نیۆ ئیستیعمار ، یان « ئیستیعماری نوێ »** Neocolonialisme

لە سەردەمی لەناو چونی سیستەمی ولاتە ژێر دەستەکانی ئیمپریالیزمدا ، بەرامبەر راپەڕینی ئازادیخوازانەی نەتەوەییو داوا کردنی سەربەخۆییدا ، لەو کاتانەدا کە ئیتر ئیمپریالیزم ئەو هیوایە نامێنێت وەکو جاران ولاتان ژێر دەستە بکات، واتە دەسەلاتی تەواوو ئاشکرا وسیاسەتی ئابوریو سەربازی خۆی بە سەریانا بسەپێنێ ، ناچار ئەبن بۆ ئەوەی جارێکی تر دەسەلاتی سیاسیو ئابوریو سەربازی خۆیان لە ولاتاندا بچەسپێننو ئایدیۆلۆجیەتی خۆیان بلاو بکەنەوە دەست بدەنە جۆرە کردارێکی ترو شێوازو ئوسلوبی تازە بەکار بێنن ، تاکو بە ئەنجامی خۆیان بگەن . ئەم نیازانەیان لە روی ماهیەتەوە ماهیەتێکی ئیستیعماریانەیان هەیە ، بەلام شێوازە کانیان تازەن . لەگەل شێوازی ئیستیعماری کۆن دا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا جیاوازە .. لەبەر ئەوە ئەمەیان پێ ئەلێن « ئیستیعماری نوێ »یان ئیستیعماری تازە . لە هەمان کاتا کە ئیمپریالیزم پەنا ئەباتە بەر شێوازی ئیستیعماری تازە ، ئا لەو کاتەدا نیشانەی تێکشکانی هەمو جۆرە سیاسەتێکی ئیمپریالیزمە لە جیهاندا .

**ئەم شێوە تازانەی ئیمپریالیستەکان چییە ؟**

**گەورە ترینیان ئەمانەن :**

١ ـ دەسەلات سپاردن بە چەند دەستەو کۆمەلێکی ناو خۆیی کە هەر یەکەیان بە جۆرێک پەیرەوی سیاسەتەکانی ئیمپریالیزم بکاتو لە

سەری بڕواتو پەنا بەرنە بەر پیلان نانەوەو کودتاو تیرۆرو ئەمجۆرە شتانە •

٢ ـ گەورەترین چەرخو دەزگای سنعەتی یان بە دەستەوە بێت ، بازرگانیو کشتوکاڵ بخەنە ژێر دەست خۆیانەوە ئەویش بە هۆی دانانی دەسمایەو دەست گرتن بەسەر رێگای سەرمایەدا ، قەرزو قۆڵەدان ، بەرێوە بردنی سیاسەتی بەناو یارمەتیدانو زۆر هێنان بۆ ئابوریو دەسەنە خۆر کردنی کۆمەڵە دەسەلاتدارەکان •

٣ ـ ئاڵو گۆڕی بازرگانی بە شێوەی نابەرامبەر کە بەر هەڵستی گەشە کردنی ئابوری وڵات بووەستێو وڵات وەکو بازاڕێکی کەرەسەی خاوی هەرزان بهێڵێتەوە •

٤ ـ دامەزراندنی بانقو کونسرنو دەزگای ئابوری تر کە لە ناو دەوڵەتدا دەوڵەتانە رەفتار بکەن جڵەوی ئابوری وڵاتیان بە دەستەوە بێت وەکو : کونسرسیۆمی نێو نەتەوەیی نەوتو بانقی فراوانکردنی سنعەتیو کانەکانو ••••

٥ ـ بەستنی پەیمانی نابەرامبەری لەگەل هەلو مەرجی گرانو ژێر دەستە کردنی سیاسیو لەشکریو ئابوری •

٦ ـ راکێشانی وڵاتەکان بۆ ناو پەیمانی سەربازی دوو لایەنە ، یان ناوچەیی وەکو پەیمانی ئەوسای «سەنتۆ »و ریکەوتننامەی دو لایەنی نێوان ئێران‌و ئەمەریکا •

٧ ـ سود وەرگرتن لە دەزگاو دامەزراوە بەناو روشنبیری‌یەکان‌و چاپەمەنی‌و خێر خوازی‌و هاریکاری‌و ئەمجۆرە شتانە •

٨ ـ هەوڵدان بۆ کۆ کردنەوەو راکێشانی بۆرجوازی‌یە نیشتمانیەکان‌و سود پێ گەیاندنیان لە بواری بەکار خستنی سەرمایەکانیان‌او راکێشانی هەندێک لە توێژەکانی تری کۆمەڵ بە مەبەستی بەهێز کردنی پشتیوانی کۆمەڵایەتی خۆی •

٩ ـ سود وەر گرتن لە دوبەرەکایەتی نانەوەو شەڕو ئاژاوە نانەوەو جیاوازی خستنەوە لە نێوان هێزە ئازادیخوازە نیشتمانیەکاندا •

١٠ـ سود وەر گرتن لە هەمو دژایەتی یەکی رێبازی پێشکەوتوانە بە چەندان شێوەی جۆر بەجۆر ••

ئیمپریالیزم ، بۆ بەر گرتن لە جولانەوەی ئازادیخوازانە لە لایەکەوە زۆر بە توندی داکۆکی لەسەر پاشماوەکانی ئیستیعمار ئەکات‌و لە لایەکی تریشەوە بە شێوەی ئیستیعماری تازە تێ ئەکۆشێت کە رێگای گەشە کردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی لە وڵاتە تازە گەشە کردوەکان بگرێ • ئەو

ولاَتانەی کە سەربەخۆیی نیشتمانی‌یان سەندووە • هەروەها داکۆکـی لەسەر هەمو بارو نەریتێکی کۆنەپەرستانە ئەکات‌و رێگا نادات رێژیمە کۆمەلاَیەتیە دواکەوتووەکان لەناو بچن‌و هەولّ ئـەدات کۆسپ لـە رێـگای پێشکەوتن‌و گەشە کردنی ولاَتاندا دروست بکات •

ئیمپریالیزم چەندان پەیمانی ئابوری‌و سەربازی‌و سیاسی ئەسەپێنێ بەسەر ئەو ولاَتانەدا ، کە ئەم پەیمانانەش ئەبنە هۆی لە دەست دانـی سەربەخۆیی ولاَتەکان • هەروەها لـە رێـگای ناردنـی سـەرمایە ، بازرگانی نابەرامبەر ، یاری کردن بە نرخ ، قەرزو قۆلّە ، بە چـەندان شێوە بە ناوی یارمەتی‌یەوە ، پالّەپەستو خستنە سـەر ولاَت لە لایـەن رێـکخراوە دارایی‌یە نێو نەتەوەیی‌یەکانەوە •• ولاَتان ئەچەوسێنێتەوە •

لەگـەل بەکـار هێنانـی ئـەم شـێوازانەدا ، دەولّەتـە گـەورە ئیمپریالیستیەکان چەندان ولاَتی تریان بە تایبەتـی لە ئاسـیاو ئەفەریقـاو ئەمەریکای لاتین‌دا بە خۆوە بەستـۆتەوە • ئەگـەرچی لـەو ولاَتانەدا حکومەتی ناوچەیی ، لەشکر ، دەولّەت‌و ئەنجومەنی ناو خۆ هەیەو لـە واقیع‌دا شێوەیەك سەربەخۆیی سیاسی روکەش هەیە • ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بواری ئابوری‌و سیاسەتی ئیمپریالیستیانەدا جێـگای یەکەمی گرتۆتە دەست خۆی • ئیمپریالیزمی ئەمـەریکا ئەمرۆکـە(۱) بۆتە گەورە ترین ئیستیعماری نێو نەتەوەیی جیهان • سێ چارەکی هەمو قازانجی سەرمایەی دەزگا ئینحیساری‌یەکانی ولاَتە سـەرمایەداری‌یەکان ئەچێتە گیرفانی کومپانیا ئەمەریکایەکانەوە •

ئیمپریالیستی ئەمەریکا بۆتە میراتگری هەمو نەریت‌و داب‌و سیستەمێکی ژێر دەستەکاری ئیمپریالیستی جیهـان‌و ئەمەریکا بۆتە ژاندارمی نێو

(۱) سەردەمی نوسینی کتیبەکە ئەگرێتەوە ــ **وەرگیر** ــ

نەتەوەیی هاو چەرخ ، چونکە ئەرکی لێدانی هەمو جۆرە راپەڕینێکی ئازادیخوازانەی بە ئەستۆی خۆی گرتوەو مەڵبەندی هەرە گەورەی ئیستیعماری تازەیە •

ئامانجو ئەرکی سەرەکی سەرشانی هەمو هێزە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازەکان دژی ئیمپریالیزمو ئیستیعماری تازە ئەوەیە ئەم خاڵانەی خوارەوە بەجێ بگەیەنێت :

١ ـ سڕینەوەی هەمو شوێنەوارێکو پاشماوەی ئیستیعمارو دژایەتی کردنی ئیستیعماری تازە ، ریشەکەن کردنی هەموو دەسەڵاتێکی ئیمپریالیزم ، دەرکردنی دەزگا ئینحیساری یەکانی دەرەوەو دانانی دەزگای سنعەتی نیشتمانی •

٢ ـ لەناوبردنی هەمو ریژیمە سەر بە ئیمپریالیستیەکان ، نەهێشتنی پاشماوەی فیودالی ، جێبەجێ کردنی بنچینەیانەی چارەسەر کردنی زەویوزار بە هاریکاری هەمو جوتیارەکانو بە قازانجی جوتیارەکان بێت •

٣ ـ دانانی سیاسەتێکی دەرەوەی ئاشتیخوازانەی دژی ئیمپریالیستی •

٤ ـ بڵاو کردنەوەی دیموکراتیەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی داو سەقامگیر کردنی مافو ئازادی یە دیموکراتیەکان بەو جۆرەی کە چارەنوسی وڵات بە کۆمەڵانی خەڵك بسپێردرێت •

٥ ـ دابین کردنی خۆشیو دادی کۆمەڵایەتی •

## هێزەکانی بەرهەم هێنان : Production Forces

بریتین لە هۆیەکانی کار کردن ، مەسەلەی کار کردن ، زانیاریو تەکنیك ، کە بە هۆی ئەمانەوە خێرو بێری مادی دێتە بەرهەمو ئەو کەسانەی ئەم هۆیانە لەگەل تاقیکردنەوەی خۆیانا بەکار دێنن ئەتوانن هەمو بەرهەمە پێویستی‌یەکانی ژیان بەرهەم بێنن •

لە هەمو قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆمەڵگادا ، کۆمەلانی خەلکی زەحمەتکێش هێزی هەرە بنچینەیی بەرهەم هێنانن • کۆمەلانی خەلکی زەحمەتکێش رۆلێکی گەورە لە بواری گەشە کردنی ئابوریو بەرهەم هێناندا دیاری ئەکەن • هێزە بەرهەم هێنەرەکان توخمە شۆرشگێرەکانی بەرهەم هێنانن‌و گەشە کردنیان لە گەل گەشە کردنی باری کۆمەلایەتیدا ئەروات •

هێزە بەرهەم هێنەرەکان خالی پەیوەندی نێوان ئادەمیزادو هێزە سروشتی‌یەکانن ، بەرادەی زالبونی ئادەمیزاد بەسەر بوارەکانی سروشت دا هێزە بەرهەم هێنەرەکان گەشە ئەکەن ، واتە هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و دەستاوردەکانی کارکردن گەشە ترو هەمە لایەنیانە تر ئەبن • ئاستی زانیاری چالاکی‌و فەرهەنگی مرۆڤ بەرز تر ئەبێتەوە •

لە بواری بەرهەم هێناندا مرۆڤ گەورەترین هۆی بەرهەم هێنانە •• چەرخی نوێ دروست ئەکەن ، سود لە هەمو لایەنە سروشتی‌یەکان وەرئەگرن ، بە سەر هێزە سروشتی‌یەکانا زال ئەبن ، زانیاری تەکنیکی‌و زانستی خۆیان زیاتر ئەکەن ، بەمجۆرە پێداویستیەکانی گەشە کردن‌و بەرهەم هێنان دابین ئەکەن •

## هۆیەکانی بەرهەم هێنان : Production Means

بریتی‌یە لە پەیوەندی نێوان خەڵك لە بواری بەرهەم هێناندا ، کە ئاڵوگۆڕو دابەشکردنی خێرو بیری مادی سەقامگیر ئەکات .. وەهەر وەها پایەو ژێرخانی ئابوری کۆمەڵ پێک دێنێت • ماهیەتی ئەم هۆیانەی بەرهەم هێنانە کە سەرتاپای سیستەمی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و دەرونی کۆمەڵ دیاری ئەکات .. گرنگترین مەسەلە لە بارەی هۆیەکانی بەرهەم هێنانەوە بریتی‌یە لەوە کە ئایا هۆیەکانی بەرهەم هێنان بە دەست کێ‌وەیە ؟ ئایا بە دەست هەمو کۆمەڵەوەیە یان بە دەست چەند کەسانێکەوەن ، هەندێ کۆمەڵ یان چەند چینێکن کە سود لە خاوەنداریتی هۆیەکانی بەرهەم هێنان وەر ئەگرن‌و لەو رێگایەوە خەڵکی ئەچەوسێننەوەو دەست بەسەر بەرهەمی رەنجیانا ئەگرن • بە واتایەکی تر باری چۆنێتی هۆیەکانی بەرهەم هێنان ئەوەمان نیشان ئەدات کە ئەو هۆیانە چۆن لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا دابەش ئەکرێن •

هۆیەکانی بەرهەم هێنان‌و هێزە بەرهەم هێنەرەکان لە یەکێتی‌یەکی دیالەکتیکیانەدا یەك ئەگرنەوە ، پلەی گەشە کردوی هۆیەکانی بەرهەم هێنان ئاستی گەشە کردوی هێزە بەرهەم هێنەرەکان دیاری ئەکات • هەروەها هۆیەکانی بەرهەم هێنان کارێکی کاریگەرانە ئەکەنە سەر پێگەیشتن‌و گەشە کردنی هێزە بەرهەم هێنەرەکان ..

یاسای گشتی ئابوری لە هەمو رواڵەتێکی کۆمەڵایەتیانەو باری ئابوری‌دا بریتی‌یە لە یاسای پێکەوە گەشە کردنی هۆیەکانی بەرهەم هێنان لەگەل خەصڵەتی هێزە بەرهەم هێنەرەکانا • هێزە بەرهەم هێنەرەکان تەنیا لە کاتێکدا ئەتوانن بە شێوەی گشتی‌و بێ بەرهەڵستکاری گەشە بکەن کە هۆیەکانی بەرهەم هێنان لە کۆمەڵدا لەگەل خەصڵەت‌و

باری هێزە بەرهــــەم هێنەرەکاندا لە قۆناغێـــکی دیاردا بــە یەکسانی گەشە بــکەن •

● **هیومینیسم** Humanism

١ ـ ناوی جۆرە فەرهەنگ‌و کولتورێـکە کە بریتی بێت لــە ئەدەبی کلاسیـــکی ، کــە دیســان ئەگونجێت پێی بووترێت «مــــرۆڤ شوناسی» • ئەمەش بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەو فیزیۆلۆجی‌و زانستی پزیشــکی‌و رەوانشوناسی‌و رەووشت‌و کۆمــەڵ شوناسی‌و ئەنتــرو پۆلۆجی •

٢ ـ یان بە فەلسەفەی «شیللر»(١) ئەوترێت کە جۆرێکە لــە فەلسەفەی **سوبجلتیفیسم** •

● **یونسیف** Uniscef - UNICEF

کورتکراوەی ئەم ناونشانەیە :

United Nations International Children's Fmergency Fund, UNICEF

سندوقێکی دارایی نێو دەوڵەتانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکــانە ، بۆ کاروبارو پێویستی منالآن خەرج ئەکرێ •• ناونیشانی کورتکراوەی «یۆنسیف» لە ١١ی مانــگی کانونی یەکــەمی ساڵی ١٩٤٦ دا لــــەلایەن کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دامەزراوە • ئەم رێکخراوە بە پێی فەرمان‌و ئامۆژگاری‌یەکانی ئەنجومەنی کۆمەلآیەتی‌و ئابوری نەتەوە یەکگرتووەکان کار ئەکات • ئەرکی سەرشانی ئەم رێکخراوە چاودێری

---

(١) F. C. S: Schiller:

کردنی تەندروستی منالآنو جێبەجێ کردنی بەرنامەی خۆشگوزەرانی منالآنە لەو وڵاتانەدا کە بە هۆی کارەساتی دوەمین جەنگی جیهانییەوە زیانیان لێ کەوتووە • لە دوایدا سەرپەرشتی منالآنی وڵاتە دواکەوتووەکانی خستە ژێر چاودێری خۆیەوە •

ئەم سندوقە لە شاری «نیۆیۆرك»ە ، لە لایەن ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوەو خەڵکە خێر خوازەکانەوە باربو[1] ئەکرێ •• یەکێك لە ئەرکە هەرە دیارەکانی ئەم سندوقە دابین کردنی شیرە بۆ ئەو دایکانەی توانای بەخێو کردنی منالەکانیان نیە کە بە شیری خۆی بەخێویان بکات •

● **یونسکۆ** UNESCO

ئەم وشەیە کورتکراوەی ئەم ناونیشانەیە :

United Nations Educational Scientifie and Cultural Organization " UNESCO " .

رێکخراوی زانستیو فەرهەنگی و پەروەردەکاری نەتەوە یەکگرتووەکانە ، ناونیشانی کورتکراوەی «یونسکۆ» لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا دانراوە ، ئامانجی ئەم رێکخراوە بە پێی پەیڕەوی ناوخۆی رێکخراوەکە ئەوەیە پشتگیری ئاشتیو ئاسایشو هاریکاری نێوان نەتەوەکانی جیهان بکات لە رێگای پەروەردە کردنو زانیاریو فەرهەنگییەوە • لە پێناوی رێز گرتنی دادو دەوڵەتو یاساو مافی ئادەمیزادو ئازادی گشتیو تاکەکەسی ، بە پێی نوسراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ••

---

(١) باربو ــ یارمەتیدارایییە • ــ **وەرگیر** ــ

سێ پایەی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە :

**کۆنفرانسی گشتی :**

هەر دەوڵەتێکی ئەندام لەو ڕێکخراوەدا نوێنەری تایبەتی خۆی هەیە تیایاو هەر دو ساڵ جارێک بۆ دەنـگدانی دانانی بەرنامـەو بۆدیجـەی ساڵانەی ڕێکخراوەکە کۆ ئەبنەوە •

**دەزگای بەڕێوەبردن :**

لە ٢٤ ئەندامی ڕێکخراوەکە پێک هاتووە ، بەلای کەمەوە هـەر ساڵی دو جار کۆ ئەبنەوەو لێپرسراون بەرامبەر جێبەجێ کردنی بەرنامەی هەڵبژێردراوی ڕێکخراوەکە •

**سکرتارییەت :**

سـکرتیری گشتی لێپرسراوێتیو مەڵبەندە کـەشی لە پاریسە • • یونسکۆ یەکێکە لە ڕێکخراوە تایبەتیو دیارەکانی ڕێکخراوەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان •

چالاکییەکانی یونسکۆ لـە زەمینەی ئەم هەشت خاڵـەی لای خوارەوەدا ئەکرێ ••

**١ ـ فێر کردنو پەروەردە کردن :**

لەنـاو بردنـی نەخوێنـدەواریو فێر کـردنو پەروەردەی بنچینەیی ، فـراوانکردنـی ئاسـتی زانیاریو پەروەردە کردن ، ڕێز گرتنـی مافـی مرۆڤ لە ڕێـگای فێر کردنو پەروەردە کردنەوە ، دەس خستنی زانیـاری لـە بارەی هونـەرو فێرکردنو پەروەردە کردنەوە •

٢ـ **زانستی سروشتی :**

هاریکاری کردنی زۆرتر لە نێوان زانایانو هاندانی بە گشتی کردنی زانین •

٣ـ **زانستی کۆمەلایەتی :**

هاندانی خۆرۆشنبیر کردنو زیاتر لە یەکتر گەیشتن لە نێوان رەگەزە جیاجیاکانو نەهشتنی ناکۆکییە ئاینیو مەزهەبییەکان •

٤ ـ **چالاکی فەرهەنگی :**

فراوانبونی ئاستی فەرهەنگی لە نێوان دەولەتەکانی ئەندامو بە دەست هێنانی هەمو جۆرە بەرهەمێکی هونەریو ئەدەبیو فەلسەفییانە •

٥ ـ **هاتو چۆ کردن :**

زانیاری لە بارەی توانای کارو خوێندنەوە لە دەرەوەی ولاتو گەشتو گوزاری دۆستانە •

٦ـ **پەیوەندی خەلکی :**

ئاگادار بونی هەمو ، لە کاروبارەکانی یونسکۆ ، تێگەیشتن لە روداوە گرنگەکان لە بواری پەروەردەو فێر کردنەوە • زانینو فەرهەنگ ، یارمەتیدانی خەلك بۆ ئاسان کردنی فێربونی زانین •

**٧ـ نەخشە دانان :**

ئامادە کردنی پارەو پیداویستی بۆ قوتابخانە ، کتێبخانە ، دەزگاو دامەزراوە زانیاری‌یەکانی ئەو سەر زەمینانەی لە شەڕدا وێران کراوون‌و گەشەیان نەکردوە •

**٨ـ یارمەتی هونەری :**

پەیدا کردنی کارزان لە بواری فێر کردن‌و پەروەردە کردن‌دا ، فێر کردنی مامۆستا ، فێر کردن‌و پەروەردە کردنی گشتی ، لێکۆڵینەوەی زانستی‌یانە،راوێژ کردنی زانستی دەوڵەتە کانی ئەندام لە بواری نەهێشتنی نەخوێندەواری‌و دانانی قوتابخانەو پێگەیاندنی مامۆستاو زۆربونی ئەندازیاری کارەبایی‌و ئەمجۆرە شتانە •

## کورتەی هەندێك زاراوەو وشەی
## فەلسەفیو سیاسی بە سەر یەکدا

● **ئابسولۆتیسم** Absolutisme

ئابسولونەمانا « تەواو » ئەگرێتەوە ، مەبەست لە حکومەتێـکی تەواو لـە تەواوو سەرۆکایەتی یەك کەسە بەسەر کۆمەڵـدا ، لـەو حاڵەتـەدا دەسەڵاتی سەرۆکی حکومەت بێ سنور ئەبێت •

● **ئەپیس کوپالیسم** Episcopalisme

ناوی مەسلەکێـکە کـە لە سەدەی شازدەمدا لە ئەوروپا پەیدا بووە ، ئەم مەسلەکەش سەر بە «جان گالۆن» تیولوجیستی فەرەنسەیە ، ئەو پشتی بە سەڵتەنەت نەئەبەست ، لەو باوەڕەدا بو کە دەسەڵاتی دەرونـی زاڵـە بەسەر دەسەڵاتی گیانی دا •

● **ئوپتیمیسم** Optimisme

بڕوا کردنە بە خۆش بینیو نیازی چاکە ، ئەم زاراوەیە بە زۆری بەشێـکە لەو زاراوانەی کـە پەیوەندییان بە نیازی سیاسییەوە هەیە •

● **ئوپورتونیسم** Opportunisme

ئەو کەسانەن کە زۆر بە گورجی بە پێی گۆڕینی باری سیاسـی یان گۆڕینی ریژیم یان سەرکردەکان ئەوانیش لە پێناوی قازانجی خۆیانا بیرو رای خۆیان بەو بارەدا ئەگۆڕن •

● ئاپولوجیسم Apologisme

ناوی کۆمەڵێك بو بە ناوی « ئاپولوجیستەکان » کە لە سەدەی حەڤدەیەمدا لە ماوەی شەڕە ناو خۆییەکانی بەریتانیا لە پێناوی مافی خەڵك دا بەرەنگاری پادشا ئەوەستان • ئەو فەیلەسوفانەش لە سەرەتای پەیدابونی مەسیح دا بەرەنگاری بیروباوەڕی مەسیحیان ئەکرد بەوانیش هەر ئەوترا « ئاپولوجیست » •

● ئاتاشە Attache

پیاوی باڵۆیزخانە کان

● ئاتوریتاریانیسم Autoritarianisme

سیستەمێکی حکومەتی‌یە کە ئازادی تاکە کەسی تیا ئەکەوێتە ژێر تێشکی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە •

● ئوتوکراسی : Autocracy

بە سیستەمێکی حکومەتی ئەڵێن کە تەواوی دەسەڵات بە دەست سەرکردەکانی دەوڵەتەوە بێت •

● ئەریستوکراسی : Aristocrascy

دەوڵەتی پیاو ماقوڵان ، سیستەمو جۆرە حکومەتێکە کە دەسەڵاتی دەوڵەت بە دەست ژمارەیەکی کەم لە پیاوە ماقوڵەکانەوە بێت •

● ئەریستوکرات : Aristocrate

ئەندامی دەزگای دەسەڵاتدارێتی پیاو ماقولان کە لایەنگری دەوڵەتی پیاو ماقولان بێت •

● **ئەسکولاستیك** Schoolastic

پەندو فەلسەفەی فەیلەسوفە کانی سەدەکانی ناوەڕاست کـە لـە قوتابخانەکانـا « وانـە » یان ئەوتـــەوە ، ئەمانـــە پێیـان ئەووتـــن « ئەسکولاستیك » .. فەلسەفەی ئەو زانایانـە ـ کـە پێیـان ئەوتـن مامۆستایانی خاوەن قوتابخانە ـ بە زۆری ئاینی‌یانە بون .. ئابلار ، تامس داکن ، گیوم داکن ، سنت ئانسلم ، ... ئەمانە لەو جۆرە مامۆستایانە بون .

● **ئەسکیپیسم** Escapisme

بە مانا راکردن ئەگرێتەوە ، مەبەست راکردنە لە بەشداریکردنی کاری کۆمەلایەتیانە ، قبول نەکردنی فەرمانـی دەولـەت و بەشـداری نەکردن لە کاروباری دەولەتی دا .

● **ئەکسپانسیونیست** Expansioniste

لایەنگرانی داگیر کردنی خاکی ولاتان بەهۆی لەشکرەوە یـان لە رێـگای ئابوری‌یەوە .

● **ئالیگارشی :** Olygarichie

رەووشتی جۆرە حکومەتێـکە کە لـە لایـەن چەنـد کەسێـکەوە بەرێـوە ببرێـت و هەمو دەســـەلاتی دەولـەت بەدەســـت کۆمەلێـکی دیاریکراوەوە بێت .

● **ئیمپریال :** Imperial

ئیمپەراتۆری یان شاهەنشاهی ئەگرێتەوە .

● **ئیمپریالیست :** Imperialiste

بە لایەنگرو ئیمپەراتۆری خواز ئەلێن .

● **ئیمپریالیزم** : Imperialisme

ئیمپەراتۆریخواز ، بە بیرو باوەڕو رەووشتێك ئەڵێن کە ئامانجی هێنانەدی ئیمپەراتۆریو فراوانکردنی قەڵەمڕەوو حوکم کردن بێت بەسەر کەسانی ترا •

● **ئەگوییسم** : Egoisme

لەو باوەڕەدایە کە ئادەمیزاد لە هەمو کاتو شوێنێکدا خۆ پەرستە •

● **ئانارشی** : Anarechie

ئاژاوە ، ناڕێکو پێکیو هەراو زەنا ، لە زمانی یۆنانی دا بە مانای « بێ حکومەتی » هاتووە •

● **ئانارشیست** : Anarechiste

ئاژاوە چی

● **ئانارشیسم** : Anarechisme

ئاژاوەچی ، ئانارشیسم دەوڵەت دوچاری مەینەتی کۆمەڵایەتی ئەکات •

● **ئەنتەر ناسیونال** : International

جیهانی ، نێو نەتەوەیی

● **ئەنتەرناسیونالیسم** Internationalisme

بەرانبەر بە ناسیۆنالیزمە ، بەو بیرو باوەڕە ئەڵێن کە لەو باوەڕەدایە هاریکاریو یارمەتی نێوان نەتەوەکانی جیهان مایەی خۆشبەختیو هەمیشە بە ئاشتی پێکەوە ژیانو ئارامی نەتەوەو دەوڵەتەکانی جیهانە •

● ئەنتلکتوال Intellsctual

رۆشنبیر ، پیاوی ئازاو جوامێر ..

● ئەنتلکتوالیسم Intellectualisme

رەسەنایەتی هۆش‌و بیر ، بەوەی ئەڵێن کە لەو باوەڕەدایە زانست لە ئەقڵەوە هاتووە ، ئەقل سەرچاوەی زانین‌و دۆزینەوەی راستی‌یە ، یان زانستی راست تەنیا لە رێـگای ئەقڵ‌و هۆشەوە ئەبێت .

● ئەندوستریالیسم : Industerialisme

سنعەتیکردنی ژیانی ئادەمیزاد ، بایەخدان بە سنعەت‌و کارخانـەو چەرخ‌و ئەهمیەت دان بە تەکنیك .

● ئەندیڤیدوالیسم Individualisme

باوەڕ کردن بە رەسەنایەتی تاکە کەس ، بە پێی ئەم فەلسەفەیـە پێویستە رێـگای هەموو کەسێـك بدرێ بە ئارەزوی خۆی بیر بکاتەوەو کار بکات .

● ئۆپجکتیڤیسم Opjectivisme

کە پێیشی ئەڵێن ئایدیالیسم ،

● ئوبجکتیف

فەلسەفەیەکە راستی ئەداتە بەر سەرنجی هەست پێـکردن ..

● ئوتارکی : Autarky

واتا سەربەخۆیی ئابوری .

● ئولترا ئەندیڤیدوالیسم Ultraindivdualisme

باوەڕ کردن زیاد لەرادە بە تاکە کەس .

● ئولتیماتۆم Ultimatum

دوا پێشنیارێکە کە دەوڵەتێك ئەیدات بە دەوڵەتێکی تر ، ئەگەر هاتو ئەو پێشنیارە وەر نەگیرا ئەوا ئەبێتە شەڕ لە نێوانیاندا .

● ئیرولاسیونیسم Irolationisme

باوەڕ بون بە گرتنی یەك ڕێبازو سیاسەتو گۆشە گیری ئاشکرای نەتەوەیەك لە هاریکاری سیاسیو ئابوری دا .

● باکونی‌نیسم Bakuninisme

بیرو باوەڕی سیاسی باکونین ، پێشەواو ڕابەری ئانارشیستەکان .. ئەو ئەم بیروڕایە دامەزران کە تێکدانی دەوڵەتو پاراستنی مافی تاکە کەسی کارێکی خواوەندیانەیە .

● بەربەریسم Barbarisme

دڕندەیەتی ، حاڵەتی ژیانی سەرەتایی ، کۆمەڵگای سەرەتاییو ئەو هۆزو تیرەو خێڵانەی دورن لە شارستارنیەتی یەوە .

● بلوك Bloc

دەستەیەکی یەکگرتو ، کۆمەڵێکی پێکەوە بەستراو ..

● بورجوا Bourgeois

سەرمایەدار ، دەوڵەمەند ، شارنشین ، خاوەن سامان .

● بورجوازی Bourgeoisie

سەرمایەداری ، چینی دەوڵەمەندی مامەڵەچی .

● بنتهامیسم Benthamisme

جۆرێکە لە جۆرەکانی لیبرالیسم

● پاتریوت Patriot

نیشتمان پەروەر

● پاتریوتیسم Patriatisme

نیشتمان پەروەێتی یە

● پارتیکۆلاریسم Particularisme

پەیوەندی توندو تۆڵانەی هەر شارێک بە پاراستنی حاڵەتی تایبەتی خۆیەوە

● پلیتیك Politique

زانستی سیاسەت ، یان سیاسەت

● پارتیزان Partisan

چەتەی چەكدار ، لایەنگر ، سەربازی چیا ..

● پارلمان Parlemant

ئەنجومەنی نوێنەران ، ئەنجومەنی شوراو سەنا

● پارلامانتر Parlementaire

ئەندامی پارلمان ، دەقاندەق لەگەل نەرێتو یاساكانی پارلماندا .

● پارلمانتریسم Parlementairisme

جۆرە رەوشتێكی حكومەتە ، كە هێزە چەكدارەكان بەرپرسیاری كاروباری پارلمان ئەبن .

● پاروشیالیسم Parochialisme

سنوردانانی فیكریو دڵ بەستن بە ئەنجامی كاری كۆمەڵیو ناوچەیی .

● پاسی‌نیسم Pacifisme

ئاشتیخواز ، هەڵوێستی دژی جەنگ بە هەر جۆرو شێوەیەك بێت .

● پراگماتیسم Pragmatisme

کرداری رەسەنانەو نوختەیەك بەرامبەر بە میتافیزیك ، پێشەوای ئەم بیروڕایە « ویلیام جیمز »ی ئەمەریکایی بو .

● پرووِنسیالیسم Provinclisme

باوەڕ بون بە نەبونی ناوەندێتی کاروباری کیشوەر لە پایتەخت داو دابەشکردنی ئەرکەکانی هەر ناوچەیەك بە لێپرسراوی خۆی .

● پلوتوکراسی Ploutocracy

ناوی سیستەمێکی حکومەتی‌یە کە لە لایەن دەوڵەمەند ترین کەسی وڵاتەکەوە بەڕێوە بچێت .

● پلورالیسم Pluralisme

بە فەلسەفەی سیاسی ئەوترێ کە نابێت پەیوەندی تاکە کەس ببەسترێت بە سیاسەتی دەوڵەتەوە بەڵکو پەیوەندی تریش هەیە وەکو پەیوەندی مەزهەبی‌و ئاینی .

● تائویسم Taoisme

ناوی بیروباوەڕێکی سیاسیانەیە کە لائاوتسە لە ( ٦٠٤-٥٠١)ی پێش زاینی دایناوە ، فەلسەفەکەی جۆرە مەزهەبێکی لیبرالی‌یانە یە .

● تاکتیك Tactic

هونەری جەنگ ، رێ نیشاندانی لەشکر لە شەڕ کردن لەگەل دوژمن دا .

● **تامیسم** Thomisme

مەکتەبی سیاسی « تامس داکوین » لە ساڵانی ( ١٢٢٥ ـ ١٢٧٤ )ی پێش زاینی دا •

● **تیوکراسی** Theocratcy

بە ڕیژیمو ڕەووشتی جۆرە حکومەتێک ئەڵێن کە پیاوە ئاینی‌یەکان بیبەن بەڕێوە ، بە واتایەکی تر حکومەتی مەزهەبی یانەیە •

● **ترادیسیون** Tradition

نەریتی کۆمەڵایەتی ، عورفو عادەت ••

● **ترادیسیونالیسم** Traditionalisme

باوەڕ بە ڕەسەنیەت ، نەریت پەرستی ••

● **تروتسکی ئیسم** Trotskisme

دەستەیەکی لادەر بون لەناو ڕاپەرینی ڕوسیادا کە تروتسکی یەکێک لە پێشەواکانی ئەو ڕاپەڕینە بو •

● **تیرۆر** Terreur

دڕندەیی‌و کوشتن‌و لەناوبردنی سەرپێچی کەران

● **تیروریسم** Terrorisme

بیروباوەڕی پیاو کوژانە

● **تریدیونیون** Trade - Union

ناوی ڕێکخراوێکی کرێکارانە کە لە پێناوی باشبوونی باری ژیانی کرێکاراندا تێ ئەکوشێت ، وەکو زیاد کردنی کرێی ڕوژانەی کرێکاران‌و کەمکردنەوەی سەعاتی کارکردن ، دابین کردنی پێداویستی ژیان •

● تریدیونیونیسم Trade - Unionism

یەکێتی یەکی کرێکارانەیە ، جیاوازی لە نێوان تریدیدنیونیسمو سوشیالیزم هەیە ، کرێکاران لە سەرەتاوە ئەبنە تریدیونیونیسم •

● توتالیتاریونیسم Totalitarianisme

بە مانا حکومەتی کۆمەڵی‌یە کە دەسکاری هەمو کاروبارێکی ژیانی تاکە کەسی بکاتو رێکی بخات •

● تیرانی Tyrannie

بە دەوڵەتێکی ستەمکارو زۆردار ئەڵێن •

● تیرانیسید Tyrannicide

بەمانا زۆردار کوژی‌یەو باوەڕی بە کوشتنی نهێنی‌یانەو تیرۆری لیپرسراوانی دەوڵەتە :

● تیموکراسی Timocracy

بە حکومەتێک ئەوترێ کە لێپرسراوانی ئەو دەوڵەتە تەنیا لە پێناوی رێزو شانازی‌دا کار بکەن ، ئەم وشەیە ئەفلاتون لە کتێبەکەی خۆیا کەناوی « جمهوریەت » بو بە کاری هێناوە •

● دپارتمانتالیسم Departmentalisme

ئەو جۆرە حکومەتانەیە کە سەربەخۆیی بە ناوچەو پارێزگاکانی خۆی بدات •

● دسانترالیسم Decentralisme

بریتی‌یە لە گواستنەوەی چاودێری‌و کونترول لە دەسەلاتی ناوەندی‌یەوە بۆ سەر دەزگا ناوچەیەکان •

● دسپوت Despot

بەمانا زۆردار ئەگرێتەوە •

● دسپوتیسم Despotisme

بەو دەوڵەتە ئەڵێن کە لە لایەن کەسانی زۆردارەوە بەرێوە ببرێت•

● دیماگۆجی Demagogio

خەڵك خڵەتاندن ، سادە فریودان •

● دیموکرات Democrate

ئازادیخوا ، لایەنگری ئازادی •

● دیموکراتیک Democratique

شێوەی یەکسانی •

● دیموکراسی Democracy

ئازادیخوازی یان رەووشتێك لـــە سیاسەتو حکومەتدا کـــە دەسەڵات بەدەست خەڵكو نوێنەرانی خەڵکەوە بێت •

● دمونستراسیون Demonstration

خۆ نیشاندانی دەستە کۆمەڵێ کە چـەند تیپو گرۆیەك بەشداری تیا بکەنو بەهۆی قسە کردنەوە بۆ خەڵك لە پێناوی داخوازییەکانیانا تێ بـکۆشن •

● دوگماتیسم Dogmatisme

شوێن کەوتنی کوێرانە بە بێ پرسیار کردن بەپەیرەی رێبازێک بـــکات •

● دیالەکتیك Dialectique

قسە کردن ، گفتوگۆ کردن بۆ رونـکردنەوەی مەبەستێك بـــە

ڕێـگایەکی ئاقڵانەو مەنطقیانە کە پێی ئەڵێن «ماتەریالیزمی دیالەکتیك» •

● **دیپلومات** Diplomate

سیاسی ، سیاسەتزان •

● **دیپلوماسی** Diplomacy

سیاسـەت ، زانستی سیاسەت ، پەیمانداریتی نێـوان وڵاتانو کیشوەرەکانی دەرەوە •

● **دیکتاتۆر** Dictateur

زۆردار ، تاکەرەئی رەئی خۆ فەرز کەر ••

● **رادیکالیسم** Radicalisme

بیرو باوەڕێـکی سیاسیانەیە کە لایەنگرانی ئەو بیرو باوەڕە باری رۆژگاریان بەدڵ نیەو داوای وەزعێکی تازەو تێکشکاندنی هەمو یاساو ریژیمەکان ئەکەن ، داوای دامەزراندنی دەزگای سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوری تازە ئەکەن •

● **راسیۆنالیسم** Rationalisme

فەلسەفەی رەسەنێتی ئەقڵ ، باوەڕبون بە پێشکەوتنو سەرکەوتنی ئەقڵ بەسەر هەمو شتێکدا •

● **رستۆراسیون** Restauration

رۆژگاری گـەڕانەوەی سەڵتەنەتی بوربون کە لە ساڵی ١٨١٤ تا ١٨٣٠ ی خایاند •

● **ریفراندۆم** Referendum

پرس‌وڕا کردن بە بیروڕای گشتی لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەوەی زوربەی بیروڕای خەڵك وەر بگرێ •

● **ریفۆرم** Reforme

چارەســـەر کردنو گۆڕینی روکەش لـــە کاروباری ئابوری‌و سیاسی‌دا بێ ئەوەی پەنا ببرێتە بەر شۆڕش‌و یاخی بون •

● **ریفرماسیۆن** Reformation

زاراوەی سیاسی‌و ئابوری ، راپەڕینی چارەسەریانە •

● **رولوسیۆن** Revolution

شورش ، راپەرین‌و پەلاماردان •

● **رۆیالیسم** Royalisme

سەڵتەنەتخوازی ، شێوەیەکی سەڵتەنەتخوازی لـــە بەرامبـــەر کۆماریخوازان •

● **ریتوالیسم** Ritualisme

نەریت پەرستی ، باوەڕ بون بە نەریتە مەزهەبی‌یەکان •

● **ریفیژیۆنیسم** Revsionisme

بە بیروباوەڕی ئەدوارد برنشتاین سیاسەتزان‌و نوسەری سوشیال دیموکراتەکانی ئەڵەمان ئەڵێن •

● **ژیۆپۆلتیك** Geopoltiqoue

ناوی زانستی‌یەکی تازەیە کـــە ئامانجی لێکۆڵینەوەیە لەســـەر پەیوەندی نێـــوان جوگرافیـــاو ژیانی دەســـەڵاتدارو ئیمپەراتۆری‌یە گەورەکان •

● **ساتیاگراها** Satyagraha

دەسکەوتنی راستی ، ئەو راپەڕینە سیاسی‌و مەزهەبی‌یانەیە کـــە لە

سالی ۱۹۱۹ دا دەستی پێکرد لە رووی دەست درێژکارانی بێگانە •

● **سانترالیسم** Centralisme

شێوازی ناوەندێتی لە رەووشتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ، ناوەندێتی کاروباری دەوڵەت •

● **سزاریسم** Czarisme

حکومەتی قەیسەر ، هەر بە هەمان مەفهومی زۆردارو ئوتوکراسو دەسەڵاتی ئیمپەراتۆر هاتوە •

● **سکولاریسم** Secularisme

دنیا پەرستی ، باوەڕ بە کاروباری دنیاییو خۆشەویستی دنیاو باوەڕ نەکردن بە دەرەوەی ئەمانە •

● **سەنا** Senat

ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان ، پیاوە گەورەکان ، پیاوە دەوڵەمەندەکان ، ئەنجومەنێک کە لە لایەن خەڵکە دەرکەوتووەکانەوە ـ واتا دەوڵە مەندەکانەوە ـ هەڵبژێردرا بێت •

● **سەناتۆر** Senateur

نوێنەری ئەنجومەنی پیاوە گەورەکان ، ئەنجومەنێک کە لە لایەن خەڵکە دەرکەوتووەکانەوە هەڵبژێردرا بێت •

● **سەندیکا** Syndicat

یەکێتی کرێکاران ، نەقابەی کرێکاران ، رێکخراوەی کرێکاران •

● **سەندیکالیسم** Syndicalisme

رێبازێکی سیاسیانەو راپەڕینێکی شۆڕشگێڕانەیە ، ئامانجی ئەوەیە

به هۆی ڕێکخراوه کرێـکاری‌یه کانه‌وه ده‌وڵه‌تی دیموکراتی‌و پارلمـــانی دابمه‌زرێت •

● **سوشیالیست** Sicialiste

لایه‌نگری بیروباوه‌ڕی سوشیالیزم •

● **سوشیالیزم** Socialisme

ڕێبازێـکه ئامانجی دامه‌زراندنی کۆمه‌ڵـگای ده‌سته کۆمه‌ڵی‌یه بـــه قازانجی خه‌ڵك ، به‌هۆی ملکدارێتی ده‌وڵه‌ته‌وه هه‌مو هۆیه‌کانی به‌رهـــه‌م هێنان به ده‌ست ده‌وڵه‌ته‌وه بێت‌و ده‌وڵه‌ت سه‌رپه‌رشتی‌یان بکات •

● **شوڤینیسم** Chauvnisme

یاری کردن به نه‌ته‌وه ، یاری کردن به نیشتمان ، زیاده ره‌وی ، درۆو ده‌له‌سه‌ی کوێرانه له بواری **نیشتمان** په‌روه‌ریتی‌دا •

● **فابیانیسم** Fabianisme

ڕێبازی سیاسی ڕێکخراوێکی سوشیالیستی یانه‌یه له به‌ریتانیا ، ئه‌وانه هه‌وڵیان دا سوشیالیزم له‌ناو چینی ناوه‌ڕاست دا دابمه‌زرێنن •

● **فاشیست** Fachiste

ئه‌م زاراوه‌یه له وشه‌ی «فاشیسمۆ» که ناونیشانی دروشمی ده‌سه‌ڵات بو له رۆمی کۆن ، وه‌رگیراوه •• به مانا ئاژاوه‌چی ئه‌گرێته‌وه •

● **فیودال** Feodal

به‌و که‌سانه ئه‌ڵێن که زه‌وی‌و زاریان زۆر بێت‌و فه‌رمان به‌ســـه‌ر جوتیاره ژێرده‌سته‌کانیانا بـکه‌ن • واته ده‌ره‌به‌گ •

● **فیودالیته** Feodalite

شانشینی بچوك «طوائف الملوك» جۆره حکومه‌تێکی بچوکـه لـــه

سەدەکانی ناوەراستدا هەبون ، خاوەن ملکە بە دەسەلاتەکان هەر یەکەیان لە قەلەمرەوی خۆیانا حوکمیان ئەکرد • ئەمانە هەمیشە بە جەنگی ناو خۆی یەکترەوە خەریك بون • هیچ ئامانجێکی سیاسییان نەبووە •

● **فیودالیسم** Feodalisme

جۆرە حکومەتێکی بچوکن لە سەدەکانی ناوەراستدا هەبون ••

● **فاکسیون** Faction

بە مانا رێکخراو ئەگرێتەوە ، یان حزب ••

● **فاکسیونالیسم** Factionalisme

بە مانا حزب یان رێکخراو پەرستییە «جورجی واشنیتون» گەلێك بایەخی بەم رێبازە دابو •

● **فاناتیسم** Fanatisme

فاناتیسم یان فاناتیکیسم Fanaticisme بە مانای بیروباوەری کوێرانەو توند رەوی لە هەر رویەکەوە بێت ، سیاسی بێت یان مەزهەبی یان رەووشتی •

● **فیدرال** Federal

هاریکارێتی ، یەکێتی کار

● **فیدراسیون** Federation

یەکێتیو هاریکاری نێوان چەند دەولەتێکی سەر بە خۆ کە وەکو دەولەتێکی یەکگرتوویان لێ بێت • یان یەکێتی نێوان چەند دەستەو کۆمەلە خەلکێك •

● **فیدرالیسم** Federalisme

جۆرە حکومەتو سیاسەتێکە کە بە پێی ئەو رێبازە پێویستە ولات

لە یەکێتی چەند وڵاتێکی سەربەخۆ پێک بێت •

● **فراکسیون** Fraction

دەستەیەك هاو بیرو باوەڕ لە ناو ڕێکخراوێك یان کۆمەڵێکدا •

● **فراماکۆنری** Framaconnerie

کۆمەڵێکی نهێنی‌یە لە هەندێك وڵاتانی ئەوروپادا هەیە •

● **فیزیوکراسی** Physiocratie

ڕێبازێکە ، بە پێی ئەو ڕێبازە ئەبێت هێزی دەسەڵاتدار دەسـکاری دانانی یاسا ئابوری‌یەکان نەکات •

● **کاپیتال** Capital

سەرمایە ••

● **کاپیتالیسم** Capitalisme

واتا سەرمایە داری‌و بریتی‌یە لە سیستەمێك کە هەموو هۆیەکـانی بەرهەم هێنان بە هۆی سەرمایەی تایبەتی‌یەوە پێـك بێت‌و ئەبنـە ملـکی خاوەن سەرمایەکان •

● **کاپیتولاسیون** Capitulation

دەسەڵاتی کونسولی وڵاتێکی دەرەوەیە لەناو خۆی وڵاتێکدا بێت •

● **کاتاکلیسم** Cataclyisme

واتا لافاوی جیهانی ، ژێرەو ژور بونی وەزعێك کە سەرتاپای جیهان بـگرێتەوە •

● **کالوفینیسم** Calvinsme

ناوی ڕێبازێـکی سیاسی‌و مەزهەبی یە کـــە لـــە لایەن «کالۆین»

تیۆلۆجیستی فەرەنسەییەوە دانراوە ، ئەم ڕێبازە ڕێبازێکی ئازادیخوازانەو دیموکراتیانەیە .

● **کاسموپولیتانیسم** Cosmopolitanisme

ڕێبازێکی ژیانە کە ڕێزی هەموو بیرو هەستو داخوازیو بیروباوەڕێکی گەلان ئەگرێتو هەوڵ ئەدات بە باشی لێیان تێ بگات .

● **کرافت یونیونیسم** Craft - Unionisme

جۆرە ڕێکخراوێکی کرێکارانەیە کە جۆرە کرێکارێکی تیایە لە ئیشو کاری تایبەتیدا کار ئەکەن .

● **کۆمیتە** Comite

ئەنجومەن ، ئەو شوێنەی کە ئەندامە بەرزەکانی هەر ڕێکخراوێک یان کۆمەڵێك بۆ گفتوگۆ کردن تیایا کۆ ئەبنەوە .

● **کومینفرم** Cominform

ڕێکخراوی پەیوەندی ڕێکخراوە کرێکارییەکانە .

● **کونترسوشیال** Contratsocial

یاسایەکە ، کە سەرکردەکانی دەوڵەت بە پێی ئەو یاسایە مافی خەڵك بپارێزن .

● **کونترۆرسیسم** Controrsisme

ناونیشانی کۆمەڵێکە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە بارەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتو کلیساوە گفتوگۆیان لەناو یەکدا ئەکرد .

● **کونستی توسیو نالیسم** Constitutionalisme

مەشروطیەت ، حکومەتی مەشروطە «مەرجدار» بە پێی یاسایەك بە

ناوی یاسای بنچینەییەوە حوکمی خەڵك بکات •

● **کونسرواتیسم** Conservatisme

پارێزگاری لە بواری مەزهەبیو سیاسیو کومەلایەتی یەوە •

● **کونسرواتیرف** Conservatirph

ڕێکخراوی کۆنە پارێز ، ڕەووشتی کۆنە پارێزیانە •

● **کونسول** Consul

کاربەدەستی دەوڵەتی ، لــە وڵاتێـکی بێـگانەدا بۆ لێـکۆڵینەوەو پەیوەندی کردن لە بارەی کاروباری هاو وڵاتی‌یەکانی یەوە •

● **کونسولات** Consulat

کونسولگەری ، پلەو پایەی کونسول •

● **کۆنفیدراسێون** Confederation

یەکێتی نێوان چەند وڵاتێـك کــە هـەمویان وەکو دەوڵەتێـکی یەکگرتوو پێك هاتبن ، بەڵام لـەناو ئـەو دەوڵەتەدا هـــەر دەوڵەتێك سەربەخۆیی خۆی بپارێزیت •

● **کونفانسیون** Convention

بڕیار نامەی نێوان چەند وڵاتێك لـە بارەی بازرگـانی‌یەوە ، ناوی ئەنجومەنێکی نائاسایی‌یە کە دەسەڵاتی تـەواوی پێ درا بێت «لـە بارەی دەسکاری کردنی یاسای بنچینەییەوە» •

● **کواتیسم** Qutisme

خۆ ڕاگرتن‌و بێدەنـگی •

● **کودتا** Coudetat

گۆڕینی لە ناکاوی ڕیژیم‌و ڕوخاندنی دەوڵەت بە هۆی تاقمێکەوە

بۆ دەسەڵات گرتنە دەست •

● **کولکتیویسم** Collectivisme

سیستەمێکی کۆمەڵایەتیانەیە ، هەول ئەدات کۆمەڵ بە هۆی چەند کەسانێکەوە بەڕێوە بەبات •

● **گوبی نیسم**

بیروباوەڕی «جوزیف گوبینو» یە – ١٨١٦ – ١٨٨٢ – کە بڕوای بە یەکسانی بونی رەگەزەکانی ئادەمیزاد نەبو •

● **لگالیسم** Legalisme

بڕوای بە رەسەنێتی یاساو مافی ئادەمیزاد هەیە •

● **لیبرال** Iiberal

ئازادیخواز ، ئەوانەی رێبازی لیبرالیسم بەڕێوە ئەبەن •

● **لیبرالیسم** Liberalisme

فەلسەفەی ئازادیخوازی ، ئەو بیرو باوەڕەیە کە ئەڵێت مرۆڤ بە ئازادی لە دایک بوەو خاوەنی ویستو ئارەزووەو پێویستە رێگای بدرێ – ئەوەندەی کە ئەکرێ –ئازاد پەروەر بێتو بە ئازادی پەروەردە بکرێ•

● **ماتەریالیست** Materialist

مادی ، ئەوانەی لەسەر باوەڕی ماتەریالیزمی ئەڕۆن •

● **ماتەریالیسم** Materialisme

مادە پەرستی ، مادیەتو رەسەنێتی مادە •

● **ماکیافیلیسم** Machiavellisme

بیروباوەڕی ماکیافیلیسم کە بە فەلسەفەی ستەمو زۆرداری تازە

ناوبراوه •• بریتی‌یه له کۆمه‌ڵه یاساو ره‌ووشتێکی ماکیافیل فه‌یله‌سوف‌و سیاسه‌تزانی ئیتالیایی سه‌ده‌ی پازده‌یه‌م ، که بۆ حوکم کردن به‌سه‌ر خه‌ڵکدا دایناوه • که ئه‌مه‌ش یاساو ره‌ووشتێکی زۆردارانه‌یه •

● **میتینگ** Meeting

کۆبونه‌وه‌ی خه‌ڵك بۆ گفتوگۆ کردن‌و را ده‌ربڕین له باره‌ی مه‌سه‌له کۆمه‌ڵایه‌تی‌یه‌کانه‌وه •

● **مه‌ترووبول** Metropol

ئه‌و کیشوه‌رانه‌ی که وڵاتی ژێرده‌سته کراویان به ده‌سته‌وه‌یه •

● **مۆبۆکراسی** Mobocracy

حکومه‌تی نه‌خوێنده‌واره‌کان که به زۆری له کاتی گێژاوه گشتی‌یه‌کانا دروست ئه‌بن به شێوه‌ی کاتی •

● **مرکانتالیسم** Mercantalisme

بیروباوه‌ڕێکه ئه‌ڵێت هه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌ك کاتێك ئه‌توانێت له‌روی ئابوری‌یه‌وه به‌هێز بێت که راده‌ی ئه‌و که‌لو په‌لانه‌ی ئه‌ی نێرێته ده‌ره‌وه له‌و که‌لوپه‌لانه زیاتر بێت که له ده‌ره‌وه ئه‌ی هێنێت •

● **مونارشی** Monarchie

حکومه‌تی پاشایه‌تی ، سه‌ڵته‌نه‌تی • به‌و ده‌وڵه‌تانه ئه‌ڵێن که له لایه‌ن تاکه که‌سێکه‌وه به‌ڕێوه ئه‌بڕێت به شێوه‌ی میراتگریانه •

● **میلیتاریسم** Militarisme

به‌وانه ئه‌ڵێن که له‌و باوه‌ڕه‌دان جه‌نگ‌و ئاماده بون بۆ حاڵه‌تی جه‌نگ پیرۆز ترین ئه‌رکی سه‌رشانی ده‌وڵه‌ت‌و گه‌له •

● **ناسیونال** National

نەتەوەیی

● **ناسێونالیسم** Nationalisme

بیروباوەڕی نەتەوەییانە ، نەتەوە پەرستی ، رێز گرتنی نەتەوەیەك بە سەر نەتەوەکانی ترا ، وەفا داری تەواو بەرامبەر بە نەتەوەی خـۆی ، رێز گرتنی نەریتو یاسا نەتەوایەتیەکـانی نەتەوەی خۆی بەسـەر نەتەوەکانی ترا .

● **ویگیسم** Whiggisme

ناونیشانی ئاشکرای حزبی ئازادیخوازی بەریتانیـایە کـە تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم بەو ناوە ناو نرابو .

● **هیومنیسم** Humanisme

جۆرە فەرهەنگێکە کە سەر بە ئامۆژگای کلاسیكو کۆن بێت .

● **یوتیلیتاریانیسم** Utilitarianisme

فەلسەفەیەکی سیاسی‌یە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە هۆی کۆمەڵێك لە لیبرالەکانی بەریتانیاوە پەروەردە کراوە ، ئەم فەلسەفەیە هەمو شتێکی باش ئەخاتە ترازووی سود لێ وەرگرتنەوە .

● **یوتوپیانیسم :**

زاراوەیەکە ، لە زانستی سیاسی‌دا زۆر بـە دیارە وە بریتی‌یە لـە کۆمەڵگایەکی ئایدیالی .. یان دەوڵەتێکی بێ رەخنە .

## سوپاس

زۆر سوپاسی کاك ئەحمەد سەعیدی هونەرمەندو خۆشنوش ئەکەم ناونیشانی ئەم کتێبەی بۆ نوسیم •

فەرهەنگی نوێی سیاسی

# المصطلحات الجديدة

أو

قاموس الجديد

هان فانغ

١٥٠

رقم الاجازة : ٢١٧ في ٢/٨/٩٨٤

مطبعة الحوادث ـ بغداد
هاتف ٤١٥٢٦٨٥

نرخی ( ١٠٠٠ر١ ) ديناره